عطا عبدالرحمن محي الدين





# ئەسەدەدین شێرکۆ

## ژیاننامەو رۆڵی لە شەڕی خاچییەکاندا

### مامی (صلاح الدین)ی ئەیوبی

تێزێکی ماستەرنامە

زانکۆی سلێمانی / کۆلیژی زانستە مرۆڤایەتییەکان

بەشی مێژوو

٢٠٠٣

بسم الله الرحمن الرحيم




(هـود: ٨٨)

صَدَقَ آللهُ العَظِيم




❖ ناوی کتێب: ئەسەدەدین شێرکۆ ژیاننامەو رۆڵی لە شەڕی خاچییەکاندا

❖ ناوی نووسەر : عطا عبدالرحمن محی‌الدین

❖ ساڵی چاپ : ٢٠٠٣ ز

❖ نۆبەی چاپ : یەکەم

❖ تیراژ : ٥٠٠ دانە

❖ بڵاوکار : لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی رۆشنبیر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی - بازاڕی راپەڕین

❖ ROSHNBER@YAHOO.COM

❖ ژمارەی سپاردن : ( ٣٥ ) ی ساڵی ٢٠٠٣

# ئەسەدەدین شێرکۆ

# ژیاننامەو ڕۆڵی لە شەڕی خاچییەکاندا

ماستەرنامە

عطا عبدالرحمن محی‌الدین

بەسەرپەرشتی

د. نەبەز مەجید أمین

پێشکەشی بەشی مێژوو « کۆلیجی زانستە مرۆڤایەتی‌یەکان » ی زانکۆی سلێمانی کردووەو بەشێکە لە پێویستی‌یەکانی پلەی ( ماجستێر ) لە مێژوودا .

٢٠٠١ ز ٢٧٠١ ك

# پێشکەشە

بە مامۆستا بەڕێزەکانم لە سەرجەم قۆناغەکانی خوێندن دا

بەتایبەتی /

ئەو بەڕێزانەی کە لە سەرەتاوە یەکەم پیتی خوێندنەوەو نوسینیان فێرکردم.

لەگەڵ ئەندامەکانی خێزانەکەم

مامۆستا ﴿ ژیان ﴾ ،

﴿ ڕێژین ﴾ و ﴿ ڕەز ﴾ و ﴿ کانی ﴾

# سوپاس و پێزانین

ئاشكرایه، كه هیچ كارێكی زانستی ، گەورە بێت یان بچووك ،لەخۆوە بەئەنجام ناگات ، ئەگەر دەستی كۆمەك و هاریكاری كەسانی دی و لایەنی دی بۆ درێژ نەكرێت هەر بەم پێیە، خوێندكاری رێبازی زانستی لەسەریەتی كە سوپاس و پێزانینی خۆی بەرەو رووی ئەو كەسانە بكاتەوە ، كە هاوكاری و هاریكارییان لە بەدیهێنان و بەئەنجام گەیاندنی كارەكەیدا كردووە.

لەبەرئەوەیە ، كە یەكەم كەسێك لەو بوارەدا پێویست بێت رووی سوپاس و قەدرزانینی خۆمی پێشكەش بكەم، مامۆستای سەرپەرشتیارم (( پ.ی.د. ئەبەز مەجید ئەمین )) ە كە زۆر لەكاتی خۆی تەرخانكردووە لە پێداچوونەوەی نامەكەداو هەوڵ و كۆششی زۆری لەگەڵدا كردووە لە گشت قۆناغەكانی كارەكەدا ، ئەم نامەیەی بەردەستان لە سایەی ئەو بەرێزەوە ئەم دەقەی گرتووە . جگە لەئامۆژگاری و رێنمایی و تێبینیە بەسوودەكانی كە رۆڵێكی بەرچاوو پڕبایەخیان لە پێگەیاندن و بەئەنجامدانی بووە .

هەروەها سوپاسی (( ئەنجومەنی زانستی/ بەشی مێژوو )) ، دەكەم كە ئەركی پێداچوونەوەی گشتی تێزەكەی گرتەئەستۆ، هەروەها سوپاسی بێ‌پایانی خۆم بۆ هەردووبرای بەرێز،(( مامۆستا / جەبار حەمە ئەحمەد سەرپەرشتیاری زمانی كوردی لەیەكەی سەرپەرشتیاری پسپۆڕیو ، مامۆستا / عومەر مەعروف بەرزنجی )) دەردەبڕم ، كە ئەركی پێداچونەوەو لایەنی رێزمانی بابەتەكەیان گرتەخۆو ماندووبونیان لەگەڵ نامەكە بووەتە مایەی بە پێزكردن و دەوڵەمەند كردنی . خۆ ناشبێت ئەرك و ماندووبوونی (( مامۆستا / ژیان ))ی هاوسەرم لەیاد بكەم، كە بەهۆی جوانی خەتەكەیەوە بەردەوام ئەركی نووسینەوەی نامەكەمی لەئەستۆ گرتبوو...

بەهەمان شێوە سوپاس و پێزانینم بەرەو رووی سەرجەم کارمەندانی کتێبخانەکانی ((زانکۆی سلێمانی ، گشتی سلێمانی ، ئەوقافی سلێمانی ، مۆزەخانەی سلێمانی)) دەکەمەوە ، کە بێ پەروا ئامادەییان نیشانداوە لە کۆمەك پێکردنمدا بۆ تەواوکردنی نامەکە.

دواجارو دووبارە سوپاسێکی بەسۆزی گشت ئەو کەسانە دەکەم کە رێنماییان کردم ، دەستیان گرتم و کۆمەك و یارمەتیانداوم لە پێناو بەجێ هێنانی ئەم بابەتەدا هەرچۆنێك بووبێت قەوارەی ئەو کارە ، هەرچەندە سوپاس و ستایش لە سەرەتاو کۆتاییشدا تەنها بۆ پەروەردگاری بالا دەستە ، کە پشتگیروئاسانکارم بووە لە تەواوکردنیداو سەرکەوتن بێ پەروەردگار نایەتە دی ...

# مـەودای توێژینـەوەکـە

لێکۆڵینەوە و لێدوان و گەڕان بەدوای کەسایەتی‌یە مێژووییە ناودارەکان و سـاغ کردنەوەی تەقەلاو کۆششیان ، بەهەنگاوێکی پڕبایـەخ دادەنرێـت لەنوسـینەوەو تۆمـار کردنی مێژوودا ، چونکە ئەو ناودارانە ، کاریگەری باش و دیاریان لـە ڕابـردوودا بـۆ جـێ هێشتووین و بۆ ئێستاش جێگەی شانازی و سوود لێ بینینە.

لە پێناو نەهێشتنی هیچ کەموکوڕییەك لەنووسینەوەی مێژوودا ، پێویستە ڕۆڵـی ئەو سەرکردەو کەسیەتییە ناودارانەی کورد، کەڕۆڵی کاریگەرو لەبەرچاوو ڕاستەو خۆیـان لە ڕووداوەکاندا بینیوەو بەشداریان کردووە، لەبیر نەکرێت و پشتگوێ نەخرێن و بخرێتـە بەردەستی‌خەڵکی، بێگومان گەلی کوردیش لەنێو گەلانی خۆرهەڵاتدا، لە ڕابردووی خۆیـدا لاپەڕەیەکی پڕ لە ڕووداوی پرشنگداری لەتۆماری مێژوودا بۆ خۆی داگیر کردووە . مێـژووی سەدەکانی ناوەڕاست ، گەلێك لـەو کەڵەمێردانـەی لـەخۆگرتووە ، کـە جێدەسـتیان لـە سەرجەم بوارەکانی ژیان بەگشتی و لەبواری رامیـاری و چـالاکی سـەربازیدا بەتایبـەتی پێشکەش کردووە ودیارە •

لەبەرئەوە لێکۆڵینەوە وناساندنی ئـەو جوامێرانـەی کـورد بەنـەوەی ئـەمڕۆو داهاتوو ،کارێکی شیاوو بەبایەخە ، لەرێگەیەوە مێژوونوس وخوێنەر دەتوانـن شـارەزایی لەبارەی ژیانی ئەو کەڵەمێردانـە پەیدابکـەن ، بەتایبـەتی ئەگـەر توێژینـەوەی سـەر بەخۆلەبارەی ئەو کەسیەتیانەوە بکرێت •

ئەوەی هاندەرم بوو لە هەڵبژاردنی ( شێرکۆ ) کە بابەتی توێژینەوەکـەم بێـت • ئەو باوەڕەیە، کە مێژوو هەمیشە ئامادەبوونی لەژیاندا هەیـەو شـێرکۆش کەسـایەتیەکی بەهێزی سەردەمی خۆیەتی و سەرنجی بەلای خۆیدا کێش کردو ،هانی دام تا پتر لە بـارەی ژیانیەوە بزانم ،کە بەناودارترین کەسیەتی کورد لەبواری رامیاری و سـەربازی سـەردەمی خۆیدا دەژمێردرێت •

هەر ئەو هۆیانەیە وای لێکردم بە لـەخۆبوردویی و دڵسۆزی‌یەوە ڕوو لـەو کـارە بکەم و هەوڵبدەم ئەو کۆسپ و تەگەرانەی دێنە بەردەم توێژینەوەکە ورەم پێ بەرنـەدەن و زاڵبیم و ئەوەندەی بتوانم لە ئاشـکراکردن و تیشـك خسـتنە سـەر ڕۆڵـی پـڕ سـەروەری بەخششی ئەو کەڵەمێردە درێغی نەکەم ، چونکە ئەو جوامێرە ڕۆڵی کاریگەری هـەبووە لـە

پاراستنی ولاّتی ئیسلام له هێرشی خاچییه‌كان و به‌دی هێنانی یه‌ك پارچه‌یی به‌شێكی خاكی موسوڵمانان به‌ رزگاركردنی میسر .

له‌گه‌ڵ ئه‌مه‌ی ژیانی شێركۆ پڕه‌ له‌ فیداكاری ونه‌به‌ردی وجوامێری وڕۆڵی به‌رچاوی له‌ڕووداوه‌ رامیاری و سه‌ربازیه‌كاندا بووه‌ كه‌مایه‌ی ترس ونیگه‌رانی بوون بۆ ناوچه‌كه‌، به‌رامبه‌ر ئه‌و هه‌موو به‌خششه‌، كه‌چی وه‌ك پێویست له‌لایه‌ن توێژه‌ره‌وه‌كانه‌وه‌ بایه‌خی شایسته‌ی پێ نه‌دراوه‌ .

لێكۆڵینه‌وه‌و لێدوان له‌باره‌ی كه‌سیه‌تی شێركۆوه‌ ، هه‌روا ئاسان نییه‌و توێژه‌ر رووبه‌رووی چه‌ندین ئاسته‌نگ وگرفت ده‌بێته‌وه‌ ، له‌ئه‌نجامی كه‌می زانیاری وای لێكردووین كه‌زانیاری په‌رت وبڵاو له‌ دووتوێی كتێبه‌كاندا كۆبكه‌ینه‌وه‌ وڕێكیان بخه‌ین به‌جۆرێكی گونجاو له‌بار ، تاوێنه‌یه‌كی ڕاست ودروست نیشان بدات ، كه‌ پڕبه‌ باڵای ئه‌م كه‌ڵه‌ مێرده‌ بێت ، به‌واتایه‌كی دی ، وه‌ك كه‌سیه‌تییه‌كی زیندوو له‌به‌رچاو بێت .

- نامه‌كه‌ له‌ دوو به‌ند پێك هاتووه‌ -

به‌ندی یه‌كه‌م له‌ ( چوار ) به‌ش پێكهاتووه‌ :

***به‌شی یه‌كه‌م :***

له‌م به‌شه‌دا باسی ژیاننامه‌ی ( شێركۆ )م كردووه‌، له‌ڕووی له‌دایكبوون و گه‌وره‌ بونیه‌وه‌ . پاشان هۆكاری جێهێشتنی خێزانه‌كه‌ی له‌شاری دوین و هاتنیان بۆ تكریت ، له‌وێشه‌وه‌ بۆ موسڵ، هه‌روه‌ها باسم له‌ناوو نازناوه‌كانی كردووه‌، له‌گه‌ڵ ڕوونكردنه‌وه‌ی ڕه‌چه‌ڵه‌كی بنه‌ماڵه‌كه‌ی و ناساندنی ئه‌ندامانی خێزانه‌كه‌ی .

***به‌شی دووه‌م :***

له‌م به‌شه‌دا هه‌وڵم داوه‌ له‌ پێناو زیاتر ناساندنی كه‌سیه‌تی شێركۆ وه‌ باس له‌ خه‌سڵه‌ته‌ سه‌نگین و به‌هاداره‌ باڵاكانی بكه‌م وه‌ك : جوامێری و وه‌فاداری و سوارچاكی و دادپه‌روه‌ری و دیبلۆماسیه‌تی .

***به‌شی سێ یه‌م:***

له‌م به‌شه‌دا باسم له‌چالاكی و لایه‌نه‌كانی كارگێری و سه‌ربازی و بواری خزمه‌تگوزاری كردووه‌و كاره‌كانی خراونه‌ته‌ڕوو ، له‌لایه‌نی كارگوزاریدا باسی میرنشینه‌

سەربازییەکانی ( شێرکۆ )م کردووە لە وڵاتــی شــامدا. ئامــاژەم بــە دامــەزراندنی سـوپای ئەسەدییە داوە ،کە تایبەت بووە بە شێرکۆ ، پاشان باسی رۆڵـی ئـەم قارەمانـەم کـردووە لەناو ئە نجومەنی جەنگدا لە شام ،لەگەڵ ئەو بڕیارانـەی کـە دەریدەکـرد ، کـە چـەندە سوڵتان نوورەدین پشتی پێ دەبەست .

بەڵام لە بواری خزمەتگوزاریدا فرەلایەنە وەك لایەنی زانستی رۆڵی شێرکۆ روون کراوەتەوە کە چۆن بە پەرۆشەوە بایەخی داوە بە دروستکردنی خوێندنگا لە شاری دیمەشق و شاری حەڵەب بە ناوی خۆیەوە لەگەڵ دابین کردنی مامۆستاو پێداویستی و خەرجی بۆیان . لە بواری خزمەتگوزاری ئاینیشدا ئەم جوامێرە رۆڵی بەرچاوی لە دروستکردنی ( مزگـەوت ،خانەقـا ، رەبات ) دا بووە کە رۆڵی خۆیان لــە خواپەرستی و خوێنـدن و تەنانـەت لـە دانانی پەرتوکیشدا هەبووە .

لە دوابڕگەی ئەم بەشەدا ، ئاماژەم بە شێرکۆ داوە کە بووەتە میری حاجیان لــە ساڵی ( ٥٥٥ ك - ١١٥٩ ز ) و چۆن بە سەرکەوتوویی ئەو سەفەرەی بەئە نجام گەیاندووە .

## بــەشی چــوارەم :

### بابەتـی یەکەم /

باسی پەیوەندی شێرکۆ بەبنەماڵەی زەنگیەوە دەکەم ، پاشـــان ئامــاژە بــەرۆڵی شێرکۆ دەدەم لە پشتگیری کردنی نورەدین مەحموود لەحەڵەب لەســاڵی( ٥٤١ ك- ١١٤٦ ز ) دا ، هەروەها باس لە رۆڵی شێرکۆ دەکرێت وەك جێگری نورەدین لەوڵاتی شامدا .

دوا بڕگەی بابەتەکەم ،تەرخان کردووە بۆرۆڵــی جوامــێری شـێرکۆ لــە رۆژانــی تەنگانەدا ، کەنورەدین نەخۆشدەکەوێت .

### بابەتـی دووەم /

باس لەچالاکیەکانی شێرکۆ دەکەم، لەو کۆششــەی کــە تواندویــەتی لــەبواری سەربازی و دیبلۆماسیدا بەو هیوایەی یەك پارچەی خاکی شام بەجێ بهێنێت .

پاشان ئاماژەم کردووە ، بۆ ئە نجامەکانی ئەو چالاکییــە ،کــە بووەتــە مایــەی بەهێزکردنی موسوڵمانان و لاوازکردنی دەسەلاتی خاچییەکان لە شامدا .

**بەندی دووەم لە (سێ) بەش پێکهاتووە :**

***بەشی یەکەم /***

لەم بەشەدا باسی چالاکی یەکانی شێرکۆدەکەم لەکاتی ڕووبەڕو بوونەوەی لەگەڵ خاچییەکان لەولاتی شامدا ،ئەویش بەباسکردنی دیارترین جەنگەکانی دژ بەخاچییەکان ، کە لە سەرجەمیاندا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە .وەك شەڕی ئەرتاح ، یەغری ، ئانب ، بانیاس، مەلاحە ، صەیدا ... هتد

***بەشی دووەم /***

باسم لە سێ هەڵمەتی سەربازی شێرکۆ کردووە بۆ سەر میسر لەماوەی جیا جیادا، کە لە سالی (٥٥٩ك - ١١٦٣ز) دا دەستی پێکردووەو لە سالی (٥٦٤ك -١١٦٨ز) کۆتایی پێهاتوەو میسری لەخاچییەکان و زوڵم و زۆرداری شاور رزگار کردووە•

***بەشی سێ یەم /***

لەم بەشەدا باسی شێرکۆم کردووە ، کە پۆستی وەزارەتی وە رگرتووە لەلای خەلیفەی فاتمی وسەرکەوتوانە توانیویەتی ئەوەی پێی سپێررابوو جێبەجێی بکات • هەروەها باسی ئەنجامەکانی گرتنی میسرو سوودو خێری بۆسەر جیهانی ئیسلامی کردووە •

هەروەها باسم لەبوونی پەیوەندی خەلیفەی عەبباسی بەهەڵمەتە سەربازییەکانی شێرکۆوە کردووە ، دوابڕگەی ئەم بەشە هەوڵمانداوە بە پێی توانا لە سنووری تێکۆشان و قەناعە تماندا ڕێبازی زانستی بگرینەبەر لە چارەسەرکردنی ئەم بابەتەداو لەکۆتایی دا هیوادارم سەرکەوتنم بەدەست هێنابێت لە خستنەڕووی وێنەیەك لە ژینی ئەم سەرکردەیەو سەرجەم ئەو بارودۆخەی کە بوونە هۆی درووستکردنی ئەم کەسیەتیەو یارمەتی دەرکەوتنیدا •

## شیکردنەوەی سەرچاوەکان

لەنوسینەوەی ئەم نامەیەدا، پشتمان بەکۆمەڵێك سەرچاوە بەستووە ، سەرەڕای ژمارەیەکی زۆر لە مەراجیعی مێژوویی و جوگرافی و وێژەیی و فەرهەنگی زمان و گۆڤارو هەوڵمانداوە تیشك بخەینە سەر چەندین بیروبۆچوونی جۆراوجۆرو جودا، هەر لەبەر ئەوەشە سەرچاوەکانی نامەکە دەکەینە دوو جۆر:

یەکەم / سەرچاوە کۆنەکان.

دووەم / سەرچاوە نوێیەکان ( المراجع ).

یەکەم / سەرچاوە کۆنەکان :

بێگومان ئەم جۆرە سەرچاوانە بە برِبڕەی پشتی هەموو لێکۆڵینەوەیەك دادەنرێت ، ئێمەش لەهەوڵەکەماندا سوودمان لەو سەرچاوانە وەرگرتووە ، کە پەیوەندیدارن بەبابەتەکەوە ، لەوانە :-

کتێبی مێژووی گشتی ، مێژووی دەوڵەتان ، میرنشینەکان و شارەکان و کتێبی ( السیر والتراجم ) ، سوودیش لە کتێبی جوگرافیاو گەشتیاران و کتێبی ئەدەب و دیوانی شاعیران وەرگیراوە •

١- مێژووە گشتیەکان ( التواریخ العامه ):-

مەبەست لەو کتێبانەیە ،کەبە کورتی باس لەمێژووی جیهان دەکەن ، وە لە ناوەڕۆکیاندا بابەتی سەر بەمێژووی ئیسلامیشی تێدایە • مێژوونوسان چەند شێوازێکیان بۆ پیشاندانی بابەتەکانیان گرتووەتەبەر لەوانە :-

هەندێکیان رووداوەکانیان بە پێی کات و ساڵ بەزنجیرەی یەك لەدوای یەك نووسیووە واتە ( حولیات / ساڵەکان ) ، وەك ئەوەی ( ابن الاثیر ) لە ( الکامل فی التاریخ ) دا کردوویەتی هەروەها ( أبو الفداء ) لە ( المختصر فی اخبار البشر ) دا وە ( ابن کثیر ) لە ( البدایە والنهایە ) دا•

هەندێکی دی لە نووسەران ڕێگای پیشاندانی بابەتیان بەکارهێناوە ، واتە مێژووی ئیسلامییان کردوەتە چەند بەشێك ، بۆ ژمارەیەك دەوڵەت و میرنشین. پاشان پیشان دانی هەریەکەیان بە پێی کات و شوێنی رووداوەکان، وەك ئەوەی ( ابن خلدون ) کردوویەتی لە مێژووی ( العبر ) دا .

هەروەها ڕێبازێکی تریش هەیە، هەردوو شێوازەکەی کۆکردۆتەوەو باس لەسەر ڕووداوەکانی دەکات بە پێی ساڵ لەگەڵ ( الترجمه لوفیات کل سنه ) ، وەك ئەوەی ( سبط ابن الجوزی ) لە ( مرأه الزمان ) دا کردوویەتی .

کتێبی ( الکامل فی التأریخ )ی ابن الاثیر ( ت ٦٣٠ ك/ ١٢٣٣ ز ) لەریزی پێشەوەی سەرچاوە مێژووییەکاندا بۆ بابەتەکەمان دادەنرێت ، چونکە ژمارەیەك لەگێڕانەوەی ( روایەتی ) بنەڕەتی خستوونەتە ڕوو ، کە لەکاتیدا پەیدابون و دەرکەوتوون لەسەر شانۆی ڕووداوە سیاسیەکان ، تاوەکو مردنی بەشێوەیەکی چڕوپڕ ئاماژەی بەچەندین ڕووداو کردووە ، کە ڕاستەوخۆ پەیوەندیدارن بەباتەکەوە. بەتایبەتی لایەنی سەربازی و رامیاری، وەباسی لەو شەڕانەش کردووە کە شێرکۆ بەشداری تێدا کردوون دژ بەخاچەکان، هەرچەند نووسەر ڕۆڵی گرنگی ڕووداوەکانی بەبنەماڵەی زەنگی داوە، ئەمەش لایەنگیری نووسەر پیشان دەدات بەلای بنەماڵەی زەنگیداو هەستی ناوچەگەرێتی نووسەر دەردەخات، چونکە خەڵکی موسڵ بووەو خۆی و خێزانیشی لەژێر سایەو سێبەری بنەماڵەی زەنگیدا ژیاون. هەر لەبەر ئەوەشە، زانیاری زۆری دەربارەی بنەماڵەی زەنگی داوە ، بەلام بایەخی ڕۆڵی میرو سەرکردەکانی تر لەو سەردەمەدا کەمتر کردۆتەوە. لەنووسینەکانیدا شێوازێکی ساکاری بەکارهێناوە ، جگە لەوەی لەزۆر کاتدا پاساو بۆ هەڵوێستی بنەماڵەی زەنگی دەهێنێتەوە.

زۆر لە مێژوونوسان زانیاریان لێوەر گرتووە، وەك ( سبط بن الجوزی ) لەکتێبی ( مراة الزمان ) و ئەبو شامە ( الروضتین في اخبار الدولتین ) وە ( ابن العبری ) لەکتێبی ( تاریخ مختصر الدول ) و ( ابن واصل ) لەکتێبی ( مفرج الکروب فی أخبار بنی ایوب ) و ابو الفداء لە کتێبی ( المختصر فی أخبار البشر ).

کتێبی ( مراة الزمان ) ی سبط بن الجوزی ( ت ٦٥٤ ك / ١٢٥٦ز ) بایەخی تایبەتی خۆی هەیە ، لەو ڕووەوە کە سەردەمی شێرکۆ پێش خۆی بووەو گرنگی زۆری بەلایەنی سیاسی داوە لەنووسنەکانیداو زانیاری بەنرخ و پڕبەهای پێشکەش کردووین دەربارەی ڕۆڵی سیاسی و چالاکی سەربازی شێرکۆ لە شام و لەهەڵمەتەکانیدا بۆ سەر میسر.

بەلام أبو الفدا ( ٧٣٢ك / ١٣٣١ ز ) لە کتێبی ( المختصر فی اخبار البشر ) دا، کە کورتکراوەی ئەو زانیارانەیە، کە ( ابن الاثیر ) لەکتێبی ( الکامل ) دا باسیان لێوە دەکات، لەزۆر شوێندا دەقاودەق زانیارییەکانی وەك خۆی گواستووەتەوە.

ابن الوردي ( ٧٤٩ك/ ١٣٤٨ز ) لەکتێبی ( تتمه المختصر ) دا ، کە تەواوکەری ابو الفداء، ئەمیش تارادەیەکی زۆرپشتی بە ( ابن الاثیر ) و ( ابو الفداء ) بەستووە، جگەلەوەی گێڕانەوەکانی کورتن. هەروەها بابەتەکە زانیاری لەکتێبی ( دول الاسلام ) و ( العبر فی خبر من غبر )ی الذهبی ( ٧٤٨ك / ١٣٤٧ز ) وەرگرتووە زانیارەکانی الذهبی بەنرخ و بە پێزن، چونکە بەوردی باسی لەو رووداوانە کردووە ، کە پەیوەندییان بە شێرکۆوە بووە. هەروەها ( ابن الکثیر ) یش ( ٧٧٤ك / ١٣٧٣ز ) ی لە کتێبی ( البدایه والنهایه ) دا. بەڵام ابن الفرات ( ٨٠٧ ك / ١٤٠٤ز ) لە مێژووەکەیدا ، باسی لە زۆربەی ژیان و چالاکی سیاسی و سەربازی شێرکۆ کردووە، هەرچەندە زانیاری تازەشی زۆر تێدانییە، چونکە ئەمیش تاڕادەیەکی زۆر پشتی بەمێژوونووسانی پێش خۆیەوە بەستووە. هەرچی ابن خلدون ( ٨٠٨ك / ١٤٠٤ز ) لەکتێبی ( العبر ) دا، زانیارییەکانی لەگەڵ نووسینەکانی ابن الاثیردا لێکدەچن ، هەروەها کتێبی ( السلوك في معرفة دول الملوك ) و ( اتعاظ الحنفا ) المقریزی ( ٨٤٥ك/١٤٤١ز )ی گەلێك گێڕانەوە ( روایه )ی بەدرێژی لە رووداوی سیاسی و سەربازی کردوون ، کە بەکەڵك و بە سوودن بۆ باسەکە. وە ( ابن تغری بردی )-( ٨٧٤ ك / ١٤٦٩ ز )ی لەکتێبی ( النجوم الزاهره ) دا چەندین گێڕانەوەی لەسەر هەڵمەتەکانی شێرکۆ بۆ میسرو دەربارەی بارودۆخی رامیاری و خەلافەتی فاتمی لەو سەردەمەدا هەبووە ، جگە لە رۆڵی بەرچاوی شێرکۆ لەدژایەتی کردنی خاچیەکاندا.

٢. مێژووی دەوڵەت و میرنشینەکان :

ناوەڕۆکی ئەم کتێبانە بریتین لە : لێدوان لەسەر مێژووی دەوڵەت و میرنشینەکان و پەیدابونیان بە پێی کات و شوێنی دیاریکراو. وەك ئەو کتێبانەی ، کە تایبەتن بەدەوڵەتەکانی ( سەلجوقی و زەنگی و ئەیوبی ) و هی دیکەش.

ئەم کتێبانە گەلێك گێڕانەوەیان ( روایه ) تێدا تۆمارکراوە ، کە پەیوەندیدارە بەکەسێتی شێرکۆو باس لەخەسڵەتەکانی و چالاکییەکانی دەکەن لەبواری سەربازیدا دژ بەخاچیەکان • گرنگترین سەرچاوەشیان کتێبی ( الروضتین فی اخبار الدولتین النوریه والصلاحیه )ی ( ابو شامه ) یە ( ٦٦٥ ك / ١٢٦٦ ز ) ،کە مادەیەکی مێژوویی بەنرخی سەبارەت بە شێرکۆ باس کردووە . هەر لە سەرەتای ژیانیەوە لەگەڵ گشت چالاکییە سەربازییەکانی دژ بەخاچییەکان لەشامدا ، هەروەها هەڵمەت و شاڵاوەکانی بۆ سەر میسرو زۆریش لەخەسڵەتەکانی شێرکۆ ی خستۆتەڕوو • نووسەر لەکۆکردنەوەی زانیارییەکانیدا پشتی بەکۆمەڵێك مێژوونوسی هەڵکەوتوو بەستووە، لەوانە ( العماد

الكاتب ، القاضي الفاضل ، ابن الاثير ، ابـن شـداد ، ابـن ابـي طـي الحلبـي ) و زۆر لـە گێڕانەوە کانی ( روایەی ) البرق الشامی پاراستووە کە هی ( عمـاد الکـاتب )ن ، هەرچـەندە زۆری بەشەکانی فەوتـاون ، وەگێڕانەوەکانی ئیبن ئەبی طی هەروەها لەدوای ئەبو شـامەوە ، لە ڕووی گرنگییەوە ابن واصل ( ٦٩٧ ك/ ١٢٩٧ز ) دێت لەکتێبی ( مفرج الكروب في اخبـار بني ايوب ) دا کە ژمارەیەکی زۆر لە بەڵگەنامەی ڕەسمی گرتۆتەخۆ کە زۆربەیان بەدەسـتی القاضی الفاضل و عیماد ئەلکاتب وگەلێکی دی لە مێژوونوسانی ئەو سەردەمە نووسراون ٠

ابن واصل لەمێژوونوسانی دیەوە جیادەبێتەوە، کە ئەم پشتی بەبەرنامەیـەکی ڕوون بەستووەو بـەراوردیش دەکـات لـەنێوان دەقـەکانی بەردەسـتیداو گونجاوترینیـان هەڵدەبژێرێت ٠ لەبەرئەوەیـە، کـە ( ابـن واصـل ) یـش وەك لـە ئەبوشـامەی هاوشـانی زانیارییەکانیان لەئاستێکی بەرزدا سەیر دەکرێت ٠

هەروەها کتێبی ( تـاريخ البـاهر في الدولـة الاتـابكيـة بـالموصل )ی ابـن الاثـير ، بابەتەکەی دەوڵەمەند کردووە بەزانیاری بەکەڵك و بەسوود لەمەڕ چالاکییەکانی رامیـاری و سەربـازییەکانی شێرکۆ.

لە کتێبی ( شفاء القلوب في مناقب بني ايـوب ) ی ( الحنبلـي - ٨٧٦ ك / ١٤٧١ ز ) یشدا ، زانیاری لەسەر ڕەچەڵەك و ئـەندامانی خـێزان و چـالاکی سـەربازیی و ڕامیـاریی شێرکۆ ، بەکورتی داوە بەدەستەوە ، هەروەها سودمان لە شەرەفنـامە لە مێژووی دەوڵـەتی میرنشینە کوردییەکان، کە هی شەرەفخانی بەدلیسی ( ١٠٠٥ ك / ١٥٩٧ ز ) یـە ، وەرگرتـووە بۆ بابەتەکە ، هەرچەندە کاتەکەی دوورەو گـەلێك لەگێڕانەوەکانیشـی لێووردبوونـەوەی تێدا بەدی ناکرێت .

بەم جۆرە ئاشکرابوو لامان ، کە ئەم شێوەیە لە مێژوو گەلێك گێڕانـەوەی لـەخۆ گرتـووە ، کە پـەیوەندی بەبابـەتی لێکۆڵینەوەکـەوە هەیـە. بەواتـایـەکی دی ، گـەلێك زانیاری وردی لەسەر زۆربەی چالاکییەکانی ڕامیاری و سەربازی شێرکۆ پێشکەش کـردووە ، سەرەڕای ئاشکراکردنی ، لایەنەکانی کەسێتی شێرکۆ ، بەجۆرێك کە یارمەتیدەر بوون لـە پڕکردنەوەی هەرکەلێنێك کەدەبوو بێچارەسەر بمایەتەوە ، ئەگەر ئەم جۆرە شێوەیە لـە مێژوودا نەبوایە.

٣. مێژووی شـارەکـان :

ئەو کتێبانە دەگرێتەوە ، کە مێژووی شـارەکانی لـەخۆ گرتـووە ، لەگـەڵ ئـەو سەردەمەی شێرکۆی تێدا ژیاوە . نووسینی مێژووی شاران گەشـەی کـردووە ، بەشـێوەیەکی

لەبەرچاو ، کە پێشاندانێکی تەواوی لەمەڕ هەندێك لەشارە ئیسلامیەکانی لەخۆ گرتـووە . ئەم جۆرە سەرچاوانەش لەرووی بایەخ و گرنگیەوە ، هیچیان کەمترنییە لەجۆری پێشـوو ، بەڵکو دەبینین لەم کتێبانەدا ، زیاتر بەدرێژی وردبینی تێداکراوە ، کە ئەم ڕێـــازە لـە کتێبە مێژووییەکانی دیکەدا بەدی ناکەین ، ئەمیش لـەڕێی گرنگـی دانیــەتی بەشـارێکی تـایبەت و دەربارەی ئەو هەموو ڕووداوانەی کە تووشی هـاتوون ، لە پاڵ لێدوان لــەڕووداوی شارەکانی هاوسێشی . ابــن قلانســی ( ٥٥٥ك / ١١٦٠ ز) لـەکتێبی ( ذیـل تـاریخ دمشـق ) دا زانیاری زۆر گرنگی لەسەر بارودۆخی وڵاتی شام تێدایــە ، پێـش شـەڕی خاچییـەکان و لـە سەردەمی ئەوانیش دا .

ئەم زانیاریانەش بەسوود بوو بۆ دەرخستنی ڕۆڵی شـێرکۆ لـەگرتنی دیمەشـق و بەدیهێنـانی یەك پارچەیی خاکی شامدا .

هەروەها سوودمان لە کتێبی ( زبدة الحلب في تـاریخ حلب ) ی ابن العدیـم ( ٦٦٠ك / ١٢٦٠ ز ) وەرگرتووە ، بەتـایبەتی لەدەست نیشانکردنی ئـاستی شێرکۆ لە پلەی دەسەڵاتدا و جۆری پەیوەندی لەگەڵ نورەدین مەحمود دا .

هەروەها کتێبی (الاعلاق الخطیرة في ذکر امراء الشام والجزیرة) ( قسم الشـــام ) ی ابن شداد ( ٦٨٥ ك / ١٢٨٦ ز ) ، زانیاری بەسوودی تێدایە ، لە دەرخستنی ڕۆڵــی شـێرکۆ لەبواری خزمەتگوزاری و زانستیی و ئـایینیدا .

٤. کتێبی ژیـاننــامـە ( التراجـم ) :

مەبەست لەو نوسینە مێژووییانەیە، کە مێژوونووســان لەســەر ئــەو کەسـانەیان نووسـیووە ، کـە هاوچـەرخیان بـوون، یـان گـوێ بیسـتیان بـــوون، یـــان لەســەریان خوێندویانەتەوە. ئەم کتێبانە، زانیاری گرنگ دەخەنەڕوو، چونکە باس لــە کەسـیەتییە ڕامیاری و سەربازییەکان دەکەن . بە واتـایەکی دی، ئەم کتێبانە پڕن لەزانیاری لـــەبارەی لایەنە جیاوازەکانی ژیانی ئەو کەسایەتییانە ، کە باسیان لێوە دەکەین ، لەبەر ئەوەشــە تیشك دەخەنە سەر ئەو سەردەمەی ئەو کەسییەتی‌یەی تێیدا ژیاوە، لەگشت لایەنەکانـەوە ، سیاسی و سەربازی و ڕۆشنبیری و کارگێڕی و هی دیکەش. سەرباری ئەوەی گەلێك جـاریش تیشك دەخاتە سەر لایەنی بیرو ژیاری ئەو سەردەمەش، کە ئەو کەسێتیەی تێدا ژیاوە.

گرنگترینی ئەو کتێبانەش ، کە بۆ بابەتەکە ســوودمان لێوەرگرتـووە ، کتێبــی ( وفیات الاعیان وانباء ابناء الزمان)ی ابن خلکان ( ٦٨١ ك / ١٢٨٢ ز)ی ، کـە لەســەر زۆر لایەنی بابەتەکەوە دواوە ، هەر لەسەرەتای ژیانییەوە ، هۆکاری کۆچکردنیان بۆ تکریـت و

لەوێشەوە بۆ موسڵ ، خەسڵەتەکانی ، ژیانی ، ڕەچەڵەك و چالاکیە ڕامیاری و سەربازییەکانی.

هەر چەندە ئاشکرایە لە وەرگرتنی زانیارییەکاندا ، پشتی بە ( ابن الاثیرو ابن شداد ) بەستووە ، بەڵام زانیاری نوێشی تێدایە، لەوانە جۆری پەیوەندی نێوان شادی و بەهرۆز، کە سەرچاوەکانی دیکە ئاماژەیان بۆ نەکردووە بەو شێوەیە. هەروەها سوودامان لە کتێبی ( العبر فی خبر من غبر ) ی الذهبي ( ٧٤٨ ك / ١٣٤٧ ز ) وەرگرتووە.

٥. کتێبی گەشتیارەکان و شارەکانیان ( البلدانیون والرحاله ) :

بایەخ و گرنگی ئەم کتێبانە لەوەدایە، کە دەوڵەمەندن بەزانیاری لەسەر جوگرافیای ئەو هەرێمانەی تایبەتن بەلێکۆڵینەوەکەمان، لە ڕوونکردنەوەی شوێنی ڕووداوەکان ، بەجۆرێك دەتوانیت بڵێیت : ئەم زانیاریانە تەواوکەری زانیارییەکانی پێشوون ، کە کتێبە مێژووییەکانی دی لەسەری دوواون. گەڕانەوە بۆ ئەم سەرچاوانە پێویستن ، تا وەکو زیاتر وێنەی ڕووداوەکە ڕوون و ئاشکرابێت .

ناودارترین نووسەری ئەم جۆرە کتێبانە، یاقوت الحموی ( ٦٢٦ك/١٢٢٨ز )ی یە، لەکتێبی ( معجم البلدان ) دا، زانیاری تەواوی لەسەر شارەکانی وڵاتی شام و جەزیرەو میسر تێدایە. یارمەتیدەرم بووە لە دیاریکردنی ناوچەکان و بایەخیان ، هەروەها ئەوەی لە کتێبی ( مراصد الاطلاع علی اسماء الامکنه والبقاع )ی ( ابن عبدالحق البغدادی ) هاتووە ( ٧٣٩ك/١٣٣٨ز )یدا، دووبارەبوونەوەی زانیاریەکانی سەرچاوەکانی پێشوون، بەڵام بە جۆرێکی کورتکراو. هەروەها سوودمان لە کتێبی ( رحله ابن جبیر )ی ابن جبیر ( ٦٢٤ ك / ١٢١٥ ز ) لە باسی خوێندنگەو خانەقاو ڕەباتەکاندا لە شارەکانی دیمەشق و حەلەبدا وەرگرتووە .

٦. کتێبی وێژەو هۆنراوە ( الادب و الشعر ) :

لەگەڵ ئەوەی زۆرجار هۆنراوە بەسەرچاوەیەکی بنەڕەتی لەکتێبە مێژوویەکاندا دانانرێت ، بەڵام بەسوودە بۆ ڕوونکردنەوەی زۆرلایەنی گرنگ لەژیانی کەسێتیە مێژوویەکاندا.

لە سەردەمی شێرکۆدا ، ژمارەیەك لە شاعیران هۆنراوەیان بەسەر جوامێری و ئازایەتی شێرکۆدا هەڵداوە . ئەویش یەکێك لە خەسڵەتەکانی ڕێزگرتن لە هۆنەران و پیاوانی هۆشیارو زانستخوازان بوو، ( عماد الأصفهاني ) ( ٥٩٧ ك / ١٢٠٠ ز )ی، لە کتێبی

( خريدة القصرو جريدة العصر ) دا، ژمارەیەك هۆنراوەی بەسەر شێرکۆدا ، لە بۆنـەی جیـا جیادا گوتووە. سەرەڕای ئەوەی کە شێرکۆ لەکۆتـایی ژیـانیدا دۆسـتایەتی لەگـەڵ ( عمـاد الإصفهانی ) دا بووە، هۆنراوەکانی زۆر لایـەنی ژیـانی شـێرکۆی گرتوونـە خـۆ، لـە ڕووی ئازایەتی و جوامێریی و دادپەروەریی و دانایی و ئاکاری جوانییەوە، ئەم هۆنراوەیەش لـە کتێبی ( الروضتین ) و ( مفرج الکروب ) بـەرچاو دەکـەون. هـەروەها سـوودمان لـە دیوانـی ( عرقلـة الکلبـي )ی حسـان بـن نمـیر ( ٥٦٧ ك / ١١٧١ ز ) دا وەرگرتـووە، ئـەم شـاعیرەش هۆنراوەی زۆری لەبۆنەی جیاجیادا بۆ گووتووە، زیاتر لایەنی ئازایەتی شێرکۆی لـەکاتی هەڵمەتەکانی بۆ میسر باس دەکات. هەروەها سـوودمان لـە کتێبـی ( النكـت العصریـة في اخبار الوزارة المصرية )ی عماره اليمني ( ٥٦٩ ك / ١١٧٣ ز ) بینیووە.

٧. سەرچـاوە فـەرهەنگیەکـان / المصادر الموسوعیه :

ئەم جۆرە سەرچاوانە گرنگیان لە ڕوونکردنەوەی زاراوەکانی کارگێری و ئـابووری و کۆمەڵایەتی یدایە ، کە دەکرێت لە بابەتی لێکۆڵینەوەدا سوود لەو زاراوانە وەربگـیرێت . لەو کتێبـانە ( صبح الاعشـی فی صناعـه الانشـا )ی القلقشـندی ( ٨٢١ ك/١٤١٨ز ) و کتێبـی ( المواعظ و الاعتبار بذکر الخطط و الاثار)ی المقريزی ( ٨٤٥ ك / ١٤٤٢ ز ).

دووەم / سـەرچـاوە تـازەکـان :

توانیمان سوود لە ژمارەیەك لە سەرچاوەی تازە وەربگرین ، زیاتر بەمەبەسـتی بەسەرکـردنەوەی بیروبۆچوونە جوداوازەکـان . بەتـایبـەتی ئەوانـەی پـەیوەندیان بـەو ڕووداوانەوە هەیە، کە شێرکۆ بەشداری تێدا کـردوون یـا لایەنێك بووە تیایاندا. وە ئـەم سەرچاوانەو بەکارهێنـانیـان لەو کاتـانەدا پێویست دەبێت ، کە دەسـت ناگاتـە سـەرچاوە ئەصلیەکـان و پەیدا نابن بۆ لێکۆڵەرەوە لەوانە کتێبی ( نورالدین محمود )ی حسـین مؤنـس و کتێبی ( الشرق الاوسط والحروب الصليبيـة )ی السیدالبـاز العریـنی، هـەروەها کتێبـی ( الحرکـه الصلیبیـه )ی سعید عاشـورو کتێبـی ( الحـروب الصلیبیـه )ی ارنسـت بـارکرو گـەلێکی تر.

## بەشی یەکەم : لــە دایـك بوون و گــەورە بــوونی

### یەکــەم : لە دایك بوونی

سەرەتـای ژیـانی شێرکۆ پەردەیەکی لێڵ و تەماوی بەسەردا کشاوەو ،تـا رادەیــەك نـادیارە ، چونکە سەرچاوە مێژووییەکان شتێکی ئەو تۆیان لەم بارەیەوە تۆمار نەکردووە ، ئێمەش لێرەدا ئەو راستیە دەخەینە بەرچاو، کە ناتوانین وێنەیەکی روون پێشکەش بکەین ، تەنانەت ئەو مێژوونوسانەی لەسەر کەسیەتی ئەم کەڵە پیاوەیان نووسیوە زۆر خۆیان لە قۆناغی سەردەمی منداڵی نەداوە ، وەك دیاریکردنی ساڵی لەدایك بوونی،[1] بۆیە دەبینــین کە دەنگوباس و نووسینی ئەم زاتە لەو کاتەوە بووە ،کە ناوبانگی دەرکردووە ، بەڵگــەیش لەســەر ئەمــە لــەوەدا دیــاری دەدات ، کــەگرنگیانداوە بەســاڵ و شــوێنی مردنــی. بــەڵام سەرچاوەکانی مێژوو دەربارەی شوێنی لە دایك بوونی ( نەجمەدین ئەیوب ) ی بــرا گــەورەی شێرکۆ دەستنیشانی گوندی ( ئەجدانقان ) [2] دەکەن و [3] هەندێك لە مێژوونوسان لە دایــك بوونی شێرکۆش هەر بەو شوێنە دادەنێن و دەڵێن کوڕانی شادی لەگوندی ( ئەجدانقان ) لــە دایك بوون [4] .

( ئیــبن خەلــەکان )یــش دەڵێــت : ئــەم گونــدە لەبــەردەم شــاری دویــن[5] دایــە دانیشتوانەکەی هەمووی کوردی رەوادین [6] ،

---

(١) ابن خلكان: وفيات الاعيان ، ج٧/ ل١٣٩؛ حسين مؤنس: نورالدين محمود، ل٣١٥

(٢) ئەجدانقان : گوندێکە نزیك لە شاری دوین ، لە ناوچەی ئازربیجان (اليونيني: ذيل مرآة الزمان ، ج١ / ل٣٧)

(٣) وفيات الاعيان، ج٧ / ل١٣٩ ـ١٤٠؛ الحنبلي: شفاء القلوب ، ل٤٥.

(٤) محمد امین زکی: مێژووی کوردوکوردستان ، ج٢/ ل١١٦؛ ا ـ ب ـــ هــەوری : صــلاح الديـن ايوبی، ل٥١؛ حمەکریم عارف : کورد لە ئەنسکلۆپیدیای ئیسلامدا، ل٥٩.

(٥) دوین : شارێکە کەوتۆتە کۆتایی ناوچەکانی ئازربیجان و بەلای ئاراندا دەروانێت (ياقوت الحموی : معجم البلدان ، ج٢/ ل٤٩١؛ ابو الفداء : تقويم البلدان ، ل٢٩٩).
بەڵام سەرچاوە دێرینەکانی‌تر رایان وابــووە کــە شــاری دویــن ســەر بەئەرمینیایــە خــاوەنی ئــەم بیروڕایانــە بریتــین لــە (ابن خرداذبة : المســالك والممــالك ، ل١٢٢؛ ابن حوقل : صـورة الارض ل٢٩٢ ؛ المقديسی: احسن التقاسم ، ل٣٧٧؛ اصطخري: المسالك والممالك ، ل١٨٨).
لەلایــەکی تــرەوە ئــەم شــارە لــەپێش ئیســلامدا بەبــەردەوامی گرنگــی تایبــەتی خــۆی هــەبووەو لــە ساڵی ٣٥٠زدا کیسرای ساسانی دروستی کردووە (دائرة المعارف الاسلامية، ج٤/ ل٣٢٤) و لــە ســەردەمی ئیسلامیشدا ، چونکــە لــە دەوڵــەتی ئیســلامیدا شــارێکی ســەرسنووری بــووە لــە ناوەڕاستی ســەدەی چوارەمــی کۆچیشــدا بۆتــە مەڵبــەندی میرنشــینی شــەدادیەکان (اسمــاعيل شــكر: الشــداديون في بلاداران ، ل٣١ ، ٥١) جگــە لەمــە نــاوی ئــەم شــارە کوردییــە بــە مانــای دواندن و قسەکردن دێت (محمد امین زکی: مێژووی کوردوکوردستان ، ج٢ /ل ١١٦).

(٦) وفيات الاعيان ، ج٧ /ل١٣٩.

بەم پێیە ژیانی منداڵی لە دوین بەسەر بردووە ، بەڕادەیەك زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکان بەناوی ئەم شارەوە ناساندویانن و زۆربەی مێژوونوسان لەسەر ئەو باوەڕە یەك دەگرنەوە، کە باوکی و خێزانەکەی خەڵکی شاری ( دوین ) ن [1]

سەرەتای دەست پێکردن و بەشداری ئەم بنەماڵەیە لەو کاتەوە دەست پێدەکات، کە شادی و خێزانەکەی بە هەردوو کوڕەکەیەوە ئەیوب و شێرکۆ ، نیشتیمانی خۆیان ( شاری دوین ) جێدەهێڵن و روو دەکەنە تکریت [2]، سەبارەت بەم کۆچکردنەیش مێژوونووسان بۆچوونیان چوون یەك نیە ، هەندێکیان هۆکاری ئەم کۆچکردنە بۆ نزمی ئاستی گوزەران و ژیان و بژێوی ئەم خێزانەو گەڕانیان بەشوێن کارو ژیانێکی باشتردا دەگێڕنەوە، کە روویان لە تکریت کردووە [3] هەندێکی دیکە دەڵێن : بنەماڵەی شادی خانەدان و دەست ڕۆیشتوو دەسەڵاتداری هۆزەکەیان بوون [4] بەر لەچوونیان بۆ تکریت لە بەڕێوەبردن و کاروباری رامیاریدا شارەزاو کارامە بوون [5]

( شەرەفخان ) دەڵێت: " شادی هاوچەرخی ( فەزلون )ی سێیەم [6] بووەو دوای داگیرکردنی وڵاتەکەی لەلایەن کەرەجە [7] کانەوە شادی ئاوارە بوە" [8] سەردەمی ئەم میرەش لەنێوان ساڵانی ( ٥١٥ بۆ ٥٢٥ ك / ١١٢١ بۆ ١١٣٠ز )دا بووە [9] دیارە ئەمەش بەڵگەیەکی بەهێزە ، چونکە نائارامی و پشێوی لەناوچەکەدا ئەنجامی شەڕو شۆڕی ( ئەرمەن و [10] کەرەج و رۆم ) لەگەڵ ئەم میرنشینەدا سەری هەڵداوە .

---

(١) ابن الاثیر: تاریخ الباهر في الدولة الاتابكية ، ل١١٩؛ ابو شامة: الروضتین في اخبارالدولتین ، ج٢/ ل٢١٠؛ ابن العبري : تاريخ مختصر الدول، ل٢١٢/٢١٣ ؛ ابن واصل : مفرج الكروب ، ج١ / ل ٢،٧؛ المقريزي: المواعظ والاعتبار، ج٢ / ل٢٣٣ ؛ جمال رشيد : لقاء الاسلاف ، ل ٢٠٧ .

هەروەها بۆچونێکی تر هەیە کە دەڵێت شێرکۆ لە موسڵ لەدایك بووە بەڵام ئەم بۆچوونە لاوازەو بەڵگەیەکی سەلمێنەری لەسەر نییە . ( ابن كثير: البداية والنهاية ، ج١٢ / ل٢٧١ ).

(٢) تکریت : شارێکە دەکەوێتە نێوان بەغدادو موسڵ، لە بەغداد نزیکترەو لەرۆژئاوای رووباری دیجلەیە (معجم البلدان ، ج٢ / ل٣٨ ، صورة الارض، ل٢٥٠ )

(٣) عماد الدين خليل : عماد الدين زنكى ، ل ٧٦ ، پ ٢٦ .

(٤) وفيات الاعيان ، ج١ / ل ٢٥٥ ؛ قدرى قلعجى : صلاح الدين ، ل ١٥ ،پ٧ .

(٥) كارل بروكلمان : تاريخ الشعوب الاسلامية ، ل٣٥٠ ؛ محمد سهيل طقوشى: تاريخ الايوبيون في مصر وبلاد الشام، ل١٧

(٦) فەزلونی سێیەم: کوڕی مەنوچەهر بووە، یەکێکە لە میری شەدادییەکان لە وڵاتی ئاران لە ساڵی (٥١٥ك /١١٢١ز) دەسەڵاتی گرتۆتەدەست تا لەساڵی (٥٢٥ ك/ ١١٣٠ز) کۆچی‌دوای کردووە . (اسماعيل شكر: الشداديون في بلاد ئران ، ل ٥٦ ، ٦٩).

(٧) کەرەج : مەسیحی بوون ، نیشتەجێی شاخەکانی (قاف قان) بوون ، وڵاتی کەرەج ئێستا پێی دەوترێت گورجستان وجۆرجیا (معجم البلدان، ج٤/ل٤٤٦)

(٨) شەرەفنامە ، ل ١٢٤ ، پ١ .

(٩) اسماعيل شكر: الشداديون في بلاد اران، ل٥٨ ،٨١،

Minorsky : Stadies in caucas ain history . P. 85 – 86 .

(١٠) ئەرمەن: هەڵگری ئایینی مەسیحی بوون و نیشتەجێی ئەرمینیان ، بە رەچەڵەك ئارین (البلاذری : فتوح ، ق١ / ل ٢٣١ ).

تا کارگەیشتووەتە ئەوەی لەساڵی ( ٥١٥ك / ١١٢١ز ) شاری دوین داگیر بکری[1] سەرباری ئەمەیش سەلجوقیەکان هێرشی بەردەوامیان کردۆتە سەر ناوچەکەو زیاتر بارو دۆخەکەیان لێ شێوێنراوە دورنییە ئەم بیروڕایە زیاتر لە راستییەوە نزیك بێت سەبارەت بەدیاریکردنی هۆکاری هاتنی بنەماڵەی شادی بۆ تکریت[2]. لەهەمان کاتدا هەندێك بۆچوونی دیکە : دەرکەوتنی ئەم خێزانە لەسەر گۆرەپانی رووداوەکان بۆ ساڵی ( ٥٢٠ ك / ١١٢٦ز ) دەگەڕێننەوە[3]، هەندێکیش دەیانباتەوە ساڵی ( ٥٢٢ك / ١١٢٨ ز )[4] یان ساڵی ( ٥٢٣ك / ١١٢٩ز )[5] کەواتە دەتوانین بڵێین : هاتنی بنەماڵەی شادی بۆ تکریت لە سەرەتایی سەدەی شەشەمی کۆچیدا بووە ، وەلێرەدا پێویستە ئەوەشمان لاروون بێت ، کە شادی وەك میرێکی شەدادیەکان ( دوین )ی بەجێ نەهێشتووە ، چونکە ناوی لەلیستی فەرمانڕەوایانی شەدادیەکاندا نییە[6] و هەروەها دوای ( فەزلون )ی سێیەمیش فەرمانڕەوای شەدادیەکان بەردەوام بووە[7].

هەر لەم بارەیەوە بۆچوونی دیکەش هەیە، بۆ وێنە : شادی هاوڕێیەکی بەناوی ( المجاهد بەهرۆز ) بووە[8] دۆستایەتیەکی پتەویان لەگەڵ یەکتردا هەبووە، رووداوێك لە شاری دوین لە بەهرۆز دەقەومێ[9] لەئە نجامدا ناچاردەبێت ئەو شارە جێ بێڵێ و پەنا بباتە بەر سوڵتان ( محمد کوڕی ملکشاهی ) سەلجوقی[10] و پاش ئەوە بەماوەیەك بەدوایی شادی دا دەنێرێت لە دوین ، کاتێك شادی و منداڵەکانی دەگەنە لای بەزیادەوە خزمەتیان دەکەن و دیاریەکی زۆریان پێ دەبەخشن[11].

---

(١) المقريزي : اتعاظ الحنفا باخبار الائمة الفاطمين الخلفا ج ٣ / ل٣٠٥ .

(٢) شەرەفنامە ، ل ٧٧ ، پ ١ .

(٣) حسين مونس : نوالدين محمود ، ل ٣١٥ .

(٤) محمد جميل عوسمان : شەری ئەهلی صلیب ، ل ٣٩ .

(٥) دريد عبدالقادر : سياسه صلاح الدين ، ل٦٦ .

(٦) محمد امين زكي : مێژووی کوردو کوردستان ، ج٢ / ل٢٥٢ : اسماعيل شكر : الشداديون في بلاد اران ، ل٥٢، ٥٣ .

(٧) اسماعيل شكر : الشداديون في بلاد اران ، ل٧٠ .

(٨) المجاهد بهروز : کوری عەبدوڵڵای غەیاسی بووە ، رۆمێکی سپی پێست بووە لە شاری دوین نیشتەجێ بووە پاشان جێی هێشتوەو هاتۆتە بەغداد ماوەی ٣٠ ساڵ پۆستی شەحنکیەی بەغدادی بەدەستەوە بووە تا لە ساڵی (٥٤٠ك / ١١٤٥ز ) مردووە (ابن الجوزي : المنتظم ، ج١٠ /ل ١١٧؛ وفيات الاعيان ، ج٧ / ل ١٤١ ).

(٩) تۆمەتی چوونە لای ژنانی هەندێ لە میرانی دوین خرایە پاڵی و بەشێوەیەکی نابروبەر تیا دەرباز بوو ، دوای ئەشکەنجەدان و خەساندن (وفيات الاعيان ، ج١/ ل٢٥٥، ابن خلدون : العبر في ديوان مبتدا والخبر ، ج٥ /ل ٢٧٨ ) .

(١٠) محمد کوڕی ملکشاه: دوای مردنی براکەی بەرکیارۆق لەساڵی (٤٩٨ك/١١٠٥ز) بۆتە سوڵتان بۆماوەی ١٣ ساڵ تاوەکو ساڵی (٥١١ك /١١١٨ز ) لەشاری ئەصفەهان کۆچیدوایی کردووە لەتەمەنی٣٧ساڵیدا بوو. (حسن ابراهيم حسن: تاريخ الاسلام السياسي و الثقافي والاجتماعي، ج٤ / ل٤٣ ، ٤٦ )

( ١١ ) وفيات الاعيان ، ج١ /ل ٢٥٥ .

پاشان سولتان بەهرۆز دەكاتە ( شحنە - پارێزگار )[١] لەبەغدادو قەلای ( تكريت ) يشی دەداتێ. شادی كە جێی بڕوای بەهرۆز دەبێت دەيكاتە دزداری[٢] قەلای تكريت[٣] ، لەو دەمەدا زۆربەی دانيشتوانەكەی كورد بوون[٤] ماوەيەك لەوێ دەمێنێتەوە هەر لەوێ كۆچی دوايی دەكات[٥]، و كوڕە گەورەكەی ( نەجمەدين ) لەشوێنی دادەنرێ[٦] لە لايەكی ترەوە سەبارەت بەشادی و كەسايەتی يە كەی بیروڕای جياواز هەيە، لەوانە ( ئيبن القادسی ) رای وايە كە شادی كۆيلەی بەهرۆزی خادم بووە[٧]. بۆ ئەم مەبەستە خاوەنی كتێبی ( شفاء القلوب ) بێدەنگ نەبووەو لەم بارەيەوە رای پێچەوانەيەو دەڵێ كە ئەو بیرو رايە هەڵەيەو هەرگیز شادی كۆيلە نەبووە[٨]، نەك هەر ئەميش بەڵكو لە ناو بنەماڵەكەشيدا كاری وانەبينراوە[٩] .

پەيوەندی نێوان بەهرۆزو شادی پەيوەندی يەكی برايانە بووە[١٠] و بەهرۆز داوای لە شادی كردووە تا بێت بۆ تكريت ، لێرەدا پێويست دەكات كەمێك ئاگاداری ژيانی بەهرۆز بێت .

بەهرۆز لەماوەی ژيانی دا پێنج جار پۆستی شەحنەی بەغدادی وەرگرتووە[١١] ،تەنانەت بەرلە ( ٥٢٥ك / ١١٣٠ ز ) سێ جار ئەو پۆستەی وەرگرتووە[١٢]

---

(١) شحنە : ئەو كەسەيە كە سەرپەرشتی ئاسايشی شار دەكات . وەك پلەی بەڕێوەبەری پۆليس يان پارێزگاری شار يان حاكمی سەربازی ( الفيروز ئابادی : القاموس المحيط ، ج٢ / ل ٢٣٩ )

(٢) دزدار : وشەيەكی فارسی يە بەمانای فەرمانڕەوای قەلا دێت (الكامل ، ج٦ / ل ٦٣٧ ، المقريزی : السلوك لمعرفه دول والملوك ، ج١ / ق١ / ل٤٢ ) هەروەها لەزمانی كوردیدا مانای دز= قەلا و دار= خاوەن واتە خاوەنی قەلا.

(٣) تاريخ الباهر ، ل ١١٩ ـ١٢٠ ؛ الروضتين ، ج١ / ل ١٢٩ ؛ ابن شداد : الاعلاق الخطيرة في ذ كر امراء الشام و الجزيرة ، ل٦٠

(٤) أصطخري : المسالك والممالك ، ل٨٥–٨٦ ؛ ابن خلدون : المقدمة ، ل٧٠،٧٤ ؛ محمد سهيل طقوشي : تاريخ الايوبيين ، ل ١٧

(٥) ذيل مراة الزمان ، ج١ / ل ٣٨ .

(٦) الكامل، ج٧ / ل٢٠٠ ؛ كتاب السلوك ، ج١/ ل٤٠؛ كارل بروكلمان: تاريخ الشعوب الاسلامية ، ل٣٥٠.

(٧) وەرگيراوە لە ابن تغری البردي : النجوم الزاهرة ، ج٦ /ل ٣

(٨) شفاء القلوب ، ل ٢٣ .

(٩) محمد سهيل طقوشي : تاريخ الايوبيين ، ل ١٦ .

(١٠) و فيات الاعيان ، ج١ /ل ٢٥٥ .

(١١) لە ساڵی (٥٠٢ ـ ٥١٢ ك / ١١٠٨ ـ ١١١٨ز) سوڵتان محمد دايناوە (الكامل ، ج٦ / ل ٤٩٨ ، ٥٣٦) لە ساڵی ( ٥١٣ ـ ٥١٦ ك / ١١١٩ ـ ١١٢٢ز) سوڵتان سنجر دايناوە ( الكامل، ج٦ / ل٥٥٤ ؛ حسين امين: العراق في العصر السلجوقي ، ل٣٤٠) لە ساڵی (٥٢١ ـ ٥٢٩ك / ١١٢٧ ـ ١١٣٥ز) سوڵتان محمود دايناوە (المنتظم ، ج١٠ / ل٥ ، الكامل ، ج٦ / ل ٦١١) لە ساڵی (٥٣٢ ـ ٥٣٦ك / ١١٣٨ ـ ١١٤١ز) سوڵتان مسعود دايناوە (الكامل ، ج٧ / ل ٢٦) لە ساڵی ( ٥٣٦ ـ ٥٤٠ ك / ١١٤١ـ ١١٤٥ز) سوڵتان مسعود داناوە ( الكامل ، ج٧ /ل ٤١ ).

(١٢) نەجمەدين ئەيوب فەرمانڕەوا بووە لە تكريت ( دريد عبدالقادر : سياسه صلاح الدين ، ل ٦٦ ) .

( ئیبن خەلەکان ) دەڵێت: دوای گەیشتنی شادی ، سوڵتان شحنەی داوەتە بەهرۆز [1] کە لەو کاتەدا لەتکریت دانیشتبوو [2] ئەو ماوەیەش دەکەوێتە نێوان جاری دووەم و سێیەم لەنێوان سالآنی ( ٥١٦ ك / ١١٢٢ز ) تاكو ( ٥٢٠ ك / ١١٢٦ ز ) كە نزیكەی چوار ساڵ دەبێ كە بەهرۆز پۆستی شەحنەی بەغدادی لا نەبووە، چونكە جاری یەكەم و دووەم ماوەیەكی ئەوتۆی نەبوومو خێرا دانراوەتەوە [3] دیارە ئەو چوار ساڵەی نێوان ( ٥١٦ ك / ١١٢٢ ز ) تا ( ٥٢٠ك / ١١٢٦ز ) سەردەمێكی پشێوی و نائارامی بووەو كاتێكی لەبار بووە كە بەهرۆز بەرامبەر بەشادی وەفاو ئەمەك بنوێنێ و رزگاری بكات . ئەوەتا ئیبن خەلەكان دەڵێت: كە بەهرۆز شادی لەبیر نەكردبوو [4] لەلایەكی ترەوە چەند بۆچوونێكی تریش هەیە، لەوانە گوایا نەجمەدین و شێركۆ خۆیان هاتوونەتە بەغدادو پەیوەندیان بە بەهرۆزەوە كردووەو ئەویش كردونی بەدزداری تكریت [5] ، لەم بارەیەوە رای تریش هەیە كە دەڵێن: نەجمەدین و شێركۆ دوای دەرچوونیان لە دوین هاتوونەتە موسڵ بۆ لای سوڵتان محەمەد مەلەكشاه، خزمەتیان كردووەو ئەویش قەڵای تكریتی پێداون [6].

بەڕای ئێمە ئەم دوو بۆچوونە لاوازن و بۆ ئەم مەبەستەیش پشت دەبەستین بە ئیبن خەلەكان كە دەڵێت : پەیوەندیەكی دۆستانە لەنێوان بەهرۆزو شادی دا لە شاری دوین هەبووە پێش هاتنی هەردووكیان بۆ تكریت [7].

لێرەدا لەجێی خۆیدایەتی كە ئەوەش روون بكەینەوە ، كە لەزۆر سەرچاوەدا ئاماژە بەوە دەكەن كەگوایە سوڵتان مەسعود بەهرۆزی داناوەو تكریتی داوەتێ لەكاتێكدا كە شادی لەگەڵدا بووە، دیارە ئەمەیش هەڵەیەكی مێژوویی‌یە، چونكە سوڵتان مەسعود لە ساڵی ( ٥٢٧ ك / ١١٣٢ ز )، كە دەستەڵاتی گرتەدەست شادی لەژیاندا نەبوو، كۆچی دوایی كردبوو ، لەو كاتەدا نەجمەدین فەرمانڕەوا بووە [8]. جگە لەمەیش بەهرۆزیش لەساڵی ( ٥٣٢ ك / ١١٣٧ز ) ، لەلایەن سوڵتان مەسعودەوە بۆ جاری چوارەم دانرا بوومە [9].

---

(١) وفیات الاعیان ، ج ١ / ٢٥٥ .

(٢) له ساڵی ٥١٢ ك / ١١١٨ز) كه لابراوه (ئیبن ئه‌ثیر ده‌ڵێت : گەراوەتەوە بۆ تكریت چونكە هی خۆیەتی ( الكامل ، ج٦/ل٥٢٧ ) هەروەها لە ساڵی ٥١٩ ك / ١١٢٥ ز ) بەهرۆز لە قەڵای تكریت بووە ( بەو بەڵگەیەی كە بەهرۆز نامەی لەوێوە ناردووە بۆ خەلیفە تا ئاگاداری كاتەوە لەهاتنی طغرلی كوری سوڵتان محمد بە لەشكرەوە بۆ سەر بەغداد ( الكامل ، ج٦ / ل ٥٩٨ )

(٣) بڕوانە پەراوێزی ژمارە (١١) لاپەرە (١٦).

(٤) و فیات الاعیان ،ج ١ / ل ٢٥٥ .

(٥) مفرج الكروب ، ج ١ /ل ٧-٨ ؛ سهیل قاشا : صلاح الدین فی المصادر السریانیه ، گۆڤاری كاروان ، ژ ٦٩ / ل ١٥٦ .

(٦) البدایه و النهایه ، ج ١٢ / ل ٢٧١ .

(٧) وفیات الاعیان ، ج١ /ل ٢٥٥ .

(٨) درید عبد القادر : سیاسه صلاح الدین ،ل ٦٦ .

(٩) الكامل ، ج٧ / ل ٢٦ ؛ حسین امین : العراق فی العصر السلجوقی ، ل ٣٤٠ .

سەبارەت بە گەورە بوونی شێرکۆ لەم قۆناغەدا کە لەگەڵ باوکیدا بووە [1] و دوای مردنی باوکیشی هەر لەتکریتدا ماوەتەوە [2] بەرەوشتێکی بەرزەوە [3] لەگەڵ نەجمەدینی برایدا کاری خۆی ئەنجامداوە بێ کەموکووڕی ، سەرەرای پاککردنەوەی ناوچەکەش لەخرا پەکاران، ئەم رەفتارانەش بووە هۆی ئەوەی زیاتر خەڵکی هۆگریان بێت ، چونکە هەرێمەکە ئاوەدانی بەخۆیەوە بینی [4] لەلایەکی ترەوە ئەو داهاتەی دەستیشیان کەوتایە لەمیوانداری و هاریکاری لێقەوماواندا خەرجیان دەکرد. لەو نمونانە سالی ( ٥٢٦ك / ١١٣١ز ) کە سەرداری موسڵ ( عمادەدین ) لەگەڵ هاوڕێکانی شکستیان لەبەردەم لەشکری خەلیفە ( المسترشد بالله ) [5] و سوپای سەلجوقیەکاندا لەنزیك تکریتدا هێنا [6] . ئەم دوو برایە داڵدەیاندان و بۆ ماوەی ( ١٥ ) رۆژ خزمەتیان کردن [7] و شێرکۆ خۆی لە رووباری دیجلە پەڕاندنیەوە [8]. دیارە ئەم چاکەیەش دەوری خۆی بینی و لەبەرچاو بوو، بۆیە بەردەوام پەیوەندیان نەپچڕاو دیاری بۆ دەناردن [9]. رۆژگار وەك خۆی نەمایەوە ، ئەو پەیوەندیە توندو تۆڵەی نێوان بنەماڵەی شادی و بەهرۆز رووی کردە گرژی و ئاڵۆزی ، بۆ نمونە بەهرۆز بیستی کە شێرکۆ پیاوێکی ئەوی لەتکریت کوشتوە سەبارەت بەم رووداوەش بیروڕای جیاواز هەیە، هەندێك دەڵێن کەشێرکۆ ئەفسەرێکی سەلجوقی کوشتووە لەکاتێکدا کە بیستویەتی دەستدرێژی کردووەتە سەر ئافرەتێك و ئافرەتەکەیش پەنای بۆ شێرکۆ هێناوە [10] .

---

(١) الذهبي: سيرالاعلام، ج١٢ / ل ٢٧١ ؛ عبدالقادر النعيمي : الدارس في تاريخ المدارس ، ج١ / ل ١٥٣ .

(٢) جرجي زيدان : صلاح الدين ، ل٥ .

(٣) محمد جميل عوسمان : شەری ئەهلی صەلیب ،، ل٤٠ .

(٤) الروضتين ، ج١ / ل ٢١٠ .

(٥) (المسترشد بالله) دوای باوکی بۆتە خەلیفە لەساڵی (٥١٢ ك .. ١١١٨ ز) پیاوێکی ئازاو ئەدەب دۆست بووە لەساڵی (٥٢٩ك/١١٣٤ز) لە تەمەنی٤٥ ساڵیدا بەدەستی باطنیەکان لە هەمەدان کوژراوە (باقر امين الورد: بغداد وخلفاؤها،ل٦٢.

(٦) الكامل، ج٦/ ل٦٢٩؛ الدواداري: كنز الدرر، ج ٦/ ل٥١٠؛ مفرج الكروب، ج١/ل٨.

(٧) الكامل ج٧ /ل ٢٠٠ ؛ الروضتين ، ج١ /ل ١٢٩ ؛ الذهبي: العبر في خبر من غبر ، ج٤ / ل٦٧ ؛ كتاب السلوك ، ج ١/ ل٤٠ ؛ كنز الدرر، ج ٦ /ل٥١٠ ؛ رانسيمان : الحروب الصليبية ، ج ٢ /ل ٣٨٦ ؛ سعيد ديوەچي : تاريخ الموصل ، ج١ / ل ٢٧١ ، بسام العسلي : فن الحروب ، ل٨٢ .

(٨) اتعاظ الحنفا ، ج٣ / ل ٣٠٦ ؛ محسن محمد حسين : صلاح الدين ، ل٩ .

(٩) تاريخ الباهر ، ل ٤٤ ؛ عماد الد ين خليل : عماد الدين زنطى ، ل ٧٧ .

(١٠) وفيات الاعيان، ج١/ ل٢٥٧؛ محمد امين زكي: مشاهير الكرد، ج ١/ ل٢٦٥.

هەندێکی تر دەڵێن: شێرکۆ لە راو گەڕاوەتەوەو دەستی بەتاڵ بووە پیاوێکی مەسیحی قسەی لەگەڵ کردووە وەك گاڵتە پێکردنێك ئەمیش بەتیرێك کوشتویەتی [1]، دەڵێن (کاتب) یش بووە [2] و بە نارەوا کوژراوە [3].

هەیە دەڵێت: ئەجمەدین ئەم کارەی ئەنجام داوەو بەتیر کۆیلەیەکی بەهرۆزی کوشتوە. پاشان لەبەر شەرمی خۆی رۆیشتوون [4] وەك لایەنی هەڵسەنگاندن ئەم کارە بە نارەوا نازانم، چونکە لە هەموو ژیانی ئەم زاتەدا سەرچاوە مێژوویەکان ئاماژە بۆ ئەوە ناکەن کارێکی نابەجێی کردبێت، پێویستە ئەوەش بخەینە بەرچاو کەکورد بە پاراستنی شەرەف ناسراو بووەو بەکارێکی پیرۆزی زانیوە، چونکە ئافرەتەکە بەگریانەوە پەنای بۆ دەهێنێت و دەڵێت: دەستی بۆ درێژکردووم [5]. ئەم رووداوەش لەساڵی (٥٣٢ ك / ١١٣٧ز) دابووە [6]، برا گەورەکەشی ئەوەی پێویست بوو کردویەتی و خاوەن قەڵاشی ئاگادار کردۆتەوە، بەڵام هەندێك کەسیش لەو کاتەدا چوونەتە لای بەهرۆز بەنازایەتی و دەست و مەقامی شێرکۆ ترساندویانە، ئەمەیش هۆکاری راستەوخۆ بووە لەبەجێ هێشتنی تکریت [7]. ئەودەم بیریان لەجێگەیەك کردەوە، تا خۆیان وخێزانیان رووی تێ بکەن، بەڵام زۆر دانەمان، گورج عیمادەدین زەنگی حاکمی موسڵیان بەبیردا هات، کە کاتی خۆی یارمەتی‌یان دابوو بێگومان زەنگی لەبیری نەکردبوون [8] بەبڵاوبوونەوەی ئەم دەنگوباسە، دانیشتوانی تکریت شپرزە بوون، چونکە دڵسۆز بوون بۆیان لەبەرئەوە زۆربەیان بۆ بە رێ کردنیان لەماڵ چونە دەروو لە خەمی جیا بوونەوەیاندا دڵگران دەبن [9]

---

(١) ابن الفرات: تاريخ ابن الفرات، مجلد ٤ / ج١ /ل ٥١ ؛ ابن العماد: شذرات، ج٤ / ل ٢٦٦ ؛ كارل بروكلمان :تاريخ الشعوب الاسلامية، ل ٣٥٠.

(٢) ابن العبري: تاريخ مختصر الدول ،ل ٢١٣ .

(٣) مفرج الكروب، ج ١ / ل ٨ .

(٤) النجوم الزاهرة، ج ٦ / ل٤ .

(٥) وفيات الاعيان، ج١ / ل ٢٥٧ ؛ عماد الدين خليل: عماد الدين زنكي، ل ٧٧ ؛ عمر ابو النصر: صلاح الدين، ل ١٠ .

(٦) كتاب السلوك، ج١ / ل ٤١، پ٢ .

(٧) الروضتين، ج١/ ل١٢٩؛ المواعظ والاعتبار، ج٢/ ل٢٣٣؛ شەرەفنامە، ل١٢٧، پ١.

(٨) تاريخ الباهر، ل ٤٤ ؛ ابن الوردى: تتمه المختصر فى اخبار البشر ،ج ٢ / ل ١١٧ ؛ شەرەفنامە، ل ١٢٨ .

(٩) الروضتين ،ج١ / ل ٢١١ .

## دووەم نــازنــاوەكـانی [1]

ناوی ( شێرکۆ ) ی کوڕی ( شاد )ی کـوڕی ( مـەروان ) [2] ی کـوڕی ( یـەعقوب ) ە [3] ، چەندین نازناوی هەبووە، بەڵام زێتر وەك ( ئەسەدەدین ) ناوی دەرکردبوو [4] ، هەروەها بــە ( الملك المنصور ) یش ناوبراوە [5] دیارە نازناو لە رووی مێژوویـیەوە گرنگـی تایـەتی خـۆی هەیە ، لەبەر ئەوەی بەدرێژایی رۆژگار تیشك دەخاتە سەر رووداوە سیاسـی و سـەربازی و کۆمەڵایەتیەکان و زۆر لە ئاکار و کەسایەتی فەرمان رەواکانمان بـۆ ئاشکرا دەکـات [6].
شێرکۆ لەسەردەمی خۆیدا هەڵ کەوتوو بووە و نازنـــاوی زۆری هـەبووە ، بـە شـێکیان وەك پیاهەڵدان و بەشێکی تریان وەك دەربڕینی لە کەسیەتی ، جگە لەو نازناوانەی هەیبووە، گەلێك جاربەناوی ( باوکی حارث ) ناو براوە [7] .
بەخشینی ئەم نازناوەنە بە میرو سەرکردەکان لەخۆوە نـەبووە، بـەڵکو بـە پێی چەند خەسڵەت و ئاکارێکی دیاریکراو دەبەخشرا، وەك مەرجی ئازایەتی، چاو نەترســی ، کەسیەتی بەهێزو تێکۆشان لە ڕێگای خودادا، کە دروشمی ژیــان لــەو رۆژگــارەدا بــەرزی و شکۆمەندی ئاینی ئیسلام بووە.
لەنێوان نازناو جموجۆڵ و چالاکیەکانی‌دا پەیوەندییەکی پتەو هەبووە، کەسـێکی چاونەترس و ڕۆڵەیەکی گیان لەسەردەستی ئەوتۆ بـووە، کـە هەمیشـە شکسـتی بـەدوژمنان دەهێناو بەم پێیە ناسنامەی ( أسد الدین ) لەگــەڵ قارەمانێتی‌یەکـەیدا هـاوجووت بـوون و پێکەوە شەتەك درابوون . هەردەم لــە ڕێگـەی نـەمری و سـەرفرازیدا هـەنگاوی دەنــاو لــە جەنگـدا سەرکـەوتنی بەدەســت دەهێنــاو نازنــاوی زیــاد دەبــوو، هەرچـەندە سـەرکردەکان پێشبرکێیان لەگەڵ دەکرد، بەڵام بەهۆی سەرکەوتنەکانی‌یەوە نازناوی روو لەبرەودا بوو [8].
ئەم زاتە لەو سیفەتـانەی ، کە تێیدابوو هەمیشە سەربازێکی چاپووك و ســالارو پێشرەوی لەشکری موسوڵمانان بووە ، وەك ئاگر بەردەبووە جەستەی دوژمــن و لەبەرئــەوە نازناوی ( شێری ئاین ) یان پێ بەخشیوە ( أسد الدین ) [9] .

---

(١) نازناو: ماناى زمانەوانى جياوازە لەگەڵ بەكارهێنانى لەناو خەڵكيدا و لە رووى زمانەوە بەو شێوازە بەكارهێنراوە بۆ دەرخستنى عەيبەكان بەڵام دور لە قسەى ناشرين (القلقشندى: صبح الاعشى، ج٥/ ل٤١٢ ) پاشان بەكارهێنراوە بۆ دەرخستنى رەفتارى جوان و پياهەڵدان و ناوى چاك (حسن الباشا: الالقاب الاسلاميه فى التاريخ ، ل١).
(٢) وفيات الاعيان ،ج٢ /ل ٤٧٩ ؛ المقريزى : خطط ، ج ٣ /ل ٣٧٨ .
(٣) سير اعلام النبلاء، ج١٥/ ل٢٧٢؛ المرتضى الزبيدى: ترويح القلوب،ل٣٥.
(٤) ابن عساكر : تهذيب تاريخ دمشق الكبير ،ج ٦ / ل ٣٦٠ .
(٥) وفيات الاعيان ، ج٢ / ل٤٧٩ تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل٥٠ – ٥١ ؛ خيرالدين زركلى: قاموس الاعلام ، ج ٣ / ل ١٨٣.
(٦) نەبەز مجيد امين : المشطوب الهكارى ، ل٧٧ .
(٧) تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل ٥٠ .
(٨) تهذيب تاريخ دمشق الكبير، ج٦ /ل٣٦٠؛ الروضتين ، ج١ / ل١٦٦؛ عبدالعزيز سيدالاهل:ايام صلاح الدين، ل٤٨.
(٩) تهذيب تاريخ دمشق الكبير، ج٦/ل٣٦٠؛ عمر ابوالنصر:صلاح الدين، ل١١.

ئەم نازناوەش دەر ئەنجامی چالاکیەکانی بوون ، لێرەدا ئەم دێــرە هۆنراوەیــە دەخەینە روو، کە شاعیری عەرەب ( عماره اليمنى ) بەسەر شێرکۆدا هەڵی داوە :

واْلقابكم في الدين مثل فعالكم          تنم بها الاخبار عن كرم الخبر[1]

زۆربەی نازناوەکانی لەئەنجامی ئەو ســەرکەوتن و چالاکیانــەوە بــووە، کەلــە مەیدانی شەڕدا بەدەستی هێناون ، وەك شەڕی ( ئانب ) ساڵی ( ٥٤٤ك /ل ١١٤٩ ز ) ، کە لــە نێوان لەشکری خاچیەکان و سوپای نوردین دا رووی دا لەناوچەی ئەنتاکیە . لــەم شــەڕەدا شێرکۆ سوپای دوژمن و هەڵگری خاچەکەی شــەکەت کــرد. ئــەم ئازایــەتی و لێهاتوییــەی شێرکۆ بووە هۆی ئەوەی نازناوی ( أبــو المظفــر)ی لێ بـنرێت[2]. ئــەم پاڵەوانــە پێشــەوای لەشکرەکەی ( نورالدين محمود )[3] بووە ، سەرکردەیەکی دنیا دیدەو لێــهاتوو، بــەهەرەدارو هەموو ژیانی شەڕو بەرەنگاری بووە، وەك کەڵە مێرێك پارێزەرو رزگارکەری ئیســلام بــووە ، بۆیە مێژوونوسان وەك ئاودارو قارەمان ریز بەندی دەکەن . ( عماد الدين ) لەم دێڕەدا بــەم شێوەیە وەسفی دەکات :

ان كـهف الاسـلام انت فـلازلت          لآهـل الاسـلام خـير مـلاذ[4]

ئەم شۆڕەسوارە ئازاو ئەبەردە بەمەبەستی گێڕانەوەی شاور[5] و پاراســتنی وڵات لەهەڵمەتی سەربازی خاچیەکان ، گەیشتە میسر[6] دوابــەدوای گرتنەدەســتی دەســەڵاتی ئەم وڵاتە، خەلیفەی فاطمي ( عاضید )[7] نازناوی ( أمير الجيــوش ـ مــیری ســوپاکان ) و ( الملك المنصور ـ پاشای سەرکەوتوو ) پێ بەخشی ، کە لە میسردا زیاتر بەم نازناوە ناسـراو بوو[8].

نازناوی ( مەلیك ) لەو رۆژگارەدا ، پیاهەڵدان بووەو تایبە تمەندی خۆی هــەبووە ، هەردوو دەستەڵاتدار ئەم نازناوەیان بووە ، لەشام ( الملك العادل ـ نورەدیــن ) و لەمیســر ( الملك المنصور ـ شێرکۆ )[9]. ئەم نازناوە بۆ شێرکۆ وەك نازناوی ( تشريف ـ رێزلێنان ) بووە [10]. دوای ئەوەی بەتەواوی میســری خســتە ژێردەســەڵاتی خۆیــەوەو کاروبــاری رێکخســتن بەشێوەیەکی لــەبار ســەقامگیر بــوو، خەلیفــە عــاضد نازنــاوی ( أمــير الجيــوش ـ مــیری سوپاکان )ی گــۆڕی بەنازناوێکی بڵندتر ئەویش ( سلطان الجيوش ـ سوڵتانی لەشــکرەکان )[11] لەبەرئەوە دەکرێــت بڵێــین کەئــەم کەســایەتیە قارەمانــە هــەموو نازناوەکــانی لــە ئەنجــامی بەڵگەی لێهاتوویی و رەفتاری جوان و کردەوەی چاکیدا بوون.

---

(١) عماره اليمنى : النكت العصريه في اخبار الوزارء المصريه ، ل ٢٦٩ ـ ٢٧٠

(٢) ( نازناوەکانتان لە ئایندا وەك کردەوەکان وایە باڵی کێشاوە بەسەر چاکەکەرەکاندا لە رێزگرتندا )

(٣) الروضتين ، ج١ / ل ٥٨ : عبالطيف حمزة : أدب الحروف الصليبية ، ل٦٢ .

(٤) نورالدین: کوڕی عمادالدین زنگی‌یه ، ساڵی (٥١١ك/ ١١١٧ز) له شاری حلب له دایك بووه ساڵی (٥٤١ك / ١١٤٦ز) بۆته فه‌رمانڕه‌وا له شام ، دادپه‌روه‌ر بووه زۆر قه‌ڵاو خوێندنگه‌ی دروست کردووه ، له ساڵی (٥٦٩ك / ١١٧٣ز) کۆچی دوایی کردووه له شام (وفيات الاعيان ، ج٥ / ل١٨٤ ).

(٥) الروضتين ، ج١ / ل١٥١ ، ( تۆ په‌نای بۆ موسڵمانان هه‌میشه چاکترین په‌ناگه‌یت )

(٦) شاور: باوکی شوجاعه کوری حوجره‌دینی کوڕی شاش کوڕی هۆزانی سه‌عدیه وه‌زیری خه‌لیفه عاضیدی فاتمی بووه ( وفيات الاعيان ، ج٢ /ل ٤٣٩ ) .

(٧) بۆزیاتر زانیاری بروانه به‌ندی ( دووه‌م ) لاپه‌ره (٩٠)

(٨) خه‌لیفه عاضید: ناوی عبدالله کوڕی یوسف کوڕی حافظ ، له ساڵی (٥٥٥ ك/١١٦٠ز ) بۆته خه‌لیفه‌ی فاطمی‌یه‌کان و دواخه‌لیفه‌شیان ، له ساڵی(٥٦٧ك/١١٧١ز) کۆچی دوایی کردووه‌و له قاهیره به‌خاك سپێردراوه . (وفيات الاعيان، ج٣ / ل ١٠٩) صبح الاعشى، ج١٠ /ل ٨١ ؛ محسين محمد حسين: صلاح الدين ، ل ٣٥.

(٩) النجوم الزاهره ، ج٥ / ل ٣٥١ . دائره المعارف الاسلاميه ، مجلد ١٤ / ل ٢٦ .

(١٠) شفاء القلوب ، ل ٤٢ ؛ حسن پاشا : الالقاب الاسلاميه في التاريخ ، ل ٧٤ .

(١١) ( بۆ زیاتر زانیاری له‌م باره‌یه‌وه بروانه پاشکۆی ژماره / ٣ )

## سێیەم رەچەڵەکی

رەچەڵەك و بەرەبابی ئەم کەڵەمێردە کوردە دەگەڕێتەوە بۆ سەر هۆزی رەوادی [1] ، کە ئەویش بەشێکە لە هەزبانی [2].

( ئیبن خەلەکان ) لەوە دواوە ، کە ئەم بەرەبابە بە پێی سەرچاوە رۆشنەکانی مێژوو کوردی رەوادین [3] ، سەرباری ئەم بۆ چوونە ( ئیبن ئەثیر )یش رای وایە ، کە رۆڵەی ئەم تیرەی رەوادیە لەناو کورد دا لەهەموان خانەدارترن [4]. مێژوونوسەکان وەك ( ئەبو شامە ) و ( حەنبەلی ) و ( بەدلیسی ) و چەندین شارەزایانی تر لەسەر ئەو بۆچوونەی ( ئیبن خەلەکان ) کۆکن سەبارەت بەگێڕانەوەی رەچەڵەکی ئەم بنەماڵەیە بۆ سەر رەوادیەکان [5] بەلام لێرەدا پێویستە ئەو بۆچوونەی ( ابن کثیر ) یش نەبوێرین ، کە بنەچەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەر زەرزاریەکان کە ئەمانیش تیرەیەکن لە هەزبانیەکان ، [6] دیارە ئەمەیش پێچەوانەی قسەو بیروڕای مێژوونووسەکانە ، چونکە عەشیرەتی زەرزاری نەگەیشتونەتە شاری ( دوین ) ، هەروەها ( ابن کثیر ) لەم لێدوانەدا تەنیایەو کاتەکەشی دوای مێژوو نووسەکانی ترە . لە پوختەی ئەم بیروڕایانەدا ئەوەمان لائاشکرا دەبێت ، کە زۆربەی مێژوونوسەکان بنەچەی ئەم بنەماڵەیە دەگێڕنەوە سەر رەچەڵەکی رەسەنی کوردی ، هەرچۆنێك بێت وەك ( ئیبن خەلەکان ) باسی کردووە لە ( شادی ) بەو لاوە ناوێکی تر نەزانراوەو دەڵێت : کە زۆر لە رەچەڵەکی ئەم بنەماڵەیەم کۆڵیوەتەوەو ژمارەیەکم لە بەڵگەنامەو دۆکیومێنت دیوە ، کە سەبارەت بە موڵك و وەقف و ماڵەو بەناوی شێرکۆی کوڕی شادیە ، بەلام هەندێ لە بەسالاچووەکانی بنەماڵەکەیان ئەوەیشیان وتوە : کە شادی کوڕی مەروانە ، [7] هەروەها کە مەروان کوڕی محمد کوڕی یەعقوبە[8] بەم پێیە لەبەر رۆشنایی ئەم بیروڕایانەدا دەتوانین بە نموونە ناڕاستی بۆچوونی هەندێك نوسەران باس بکەین وەك ( ابن واصل ) باسی دەکات گوایە بنەچەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەمەوییەکان [9] ئەمەیش بۆچوونێکی درشتەو لەراستیەوە دوورە هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی لە دوورو نزیکەوە پشگیری ناکات و لە دروستکراو دەچێت.

---

(1) رەوادی : خێڵیکی کوردن و بەشێکی گەورەن لەناو هازبەنیەکاندا ، شوێنی نیشتەجێبوونیان شاری (دوین ) بووە . (اسماعیل شکر : الشدادیون فی بلاد اران ، ل ٤١ ) .

(2) هازبەنیەکان : خێڵێکی گەورەی کوردن شوێنی نیشتەجێ بوونیان لە دەوری شاری هەولێرو هەرێمی ئازربیجان و هەرێمی اران و ناوچەی جەزیرەی فرات بووە . ( احمد عبدالعزیز: الهذبانیون ، ل ٥٢ )

(3) وفیات الاعیان ، ج ٧ / ل ١٣٩ .

(4) الکامل ،ج٧ /ل ٢٠٠ .

(5) الروضتین ، ج ١ /ل ١٢٩ ؛ شفاء القلوب ، ل ٢٣ ؛ شەرەفنامە ، ل ٧٨ .

(6) البدایة والنهایة ، ج ١٢ / ل ٢٥٩ .

(7) و فیات الاعیان ، ج٧ / ل ١٤٠ ..

(8) مفرج الکروب، ج١ /ل ٣ ؛ سیر اعلام النبلاء، ج١٥ / ل ٢٧٢ ؛ الدارس فی تاریخ المدارس ، ج١ / ل١٥٢-١٥٣ .

(9) مفرج الکروب ،ج ١ / ل٣ .

هەر لەو سەردەمەدا لەناو میرو کەسایەتی‌یە ناسراوەکاندا دیاردەیەکی سەیر سەری هەڵدابوو، کەبریتی بوو لەوەی خۆیان ببەنەوە سەر بنەچەو رەچەڵەکی ئومەویەکان و تا لەو ریگەیەوە پەرە بەدەستەلاتی خۆیان بدەن [1]. بۆ نموونە، مەلیك ( اسماعیل ) [2] رەچەڵەکی خۆی گەیاندبووەوە سەر ئەمەویەکان و ناوی ( المعزلدین الله )ی بەخۆیەوە لکاندوو وتاری بەناوی خەلافەتەوە دەخوێندەوەو نازناوی ( هادی )شی بەسەر خۆیدا دابری [3]، مەلیك ( عادل ) [4] ی مامی، کە ئەم بیروڕایەی بیست تەواو دلگران بوو ، نامەیەکی گلەیی و سەرزەنشتی بۆ نارد ، کە واز لە درۆ بێنێ و بگەرێتەوە سەر رەچەڵەکی راستەقینەی خۆی و چونکە بۆتە مایەی پێکەنینی خەڵك [5]، هەر لەو بارەیەوە رایگەیاند کە اسماعیل درۆ دەکات و هەرگیز ئێمە لەنەوەی ئومەویەکان نین [6] لەلایەکی ترەوە زۆر لەسەرچاوە مێژوویەکان پێناسەی ئەم پیاوە بەوە دەکەن، کە پیاوێکی گەوجی هەڵەشەی بیر ئالۆز بووە ، تەنانەت لەگەڵ سەرباز و سەرلەشکرو دامەزراوەکانی خۆشیدا تەبانەبووە ، بۆیە سەرئەنجام لێی راپەرین و کوشتیان [7].

سەرەرای ئەمانیش هەندیکی تر، کە ئەم بنەماڵەیە دەبەنەوە سەر رەچەڵەکی ئەمەویەکان دەڵێن: شادی کوری مەروان کوری حەکەم کوری عبدالرحمانی داخل کوری معاویە کوری هیشام کوری عبدالملك کوری مەروان کوری حەکەم کوری ئەبی عاص کوری ئومەیەیە [8]. لێرەدا ئەگەر بەراوردێك لەنیوان ئەو سەردەمانەدا بکەین، کە ئەم دوو کەسەی تێدا ژیاون ، سەردەمی مەروان کوری حەکەم ( سەدەی سێیەمی ) کۆچیەو ، شادی کوری مەروانیش سەرەتایی سەدەی ( شەشەمی ) کۆچییە ،لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە شتێکی دروستکراو نەگونجاوە، کە شادی کوری مەروان کوری حەکەم بێت جگە لەمەیش هەندیکیان لەسەر رەچەڵەکی ئەمەوی دەڵێن: شادی کوری مەروان [9] ئەمەوییە. بەلام ( ئیبن ئەبی طی ) دەڵێت : درۆیەو رەچەلەکیان مەروانی نیە [10]،

-----------------------------------

(١) النجوم الزاهره ، ج ٦ / ل ٤ .

(٢) مەلیك اسماعیل : کوری سەیف ئیسلام توغتکین کوری ئەیوب ، بۆتە فەرمان رەوای یەمەن دوای باوکی لەسالی (٥٩٣ك / ١١٩٦ز) وە لەسالی (٥٩٨ك / ١٢٠١ز) مردووە ( وفیات الاعیان ، ج٢ / ل ٥٢٤ ) .

(٣) الروضیتن ، ج ١ /ل ٢١٠ ؛ مفرج الکروب ، ج ١ / ل ٣-٤ .

(٤) مەلیك عادل : ئەبوبکر محمد کوری ئەیوب کوری شادی، جێگری صلاح الدینی برای بوو لە میصر سالی (٦١٥ك / ١٢١٨ز ) مردووە. ( وفیات الاعیان ، ج٥/ ل ٧٤ ، ٧٨ )

(٥) الکامل ، ج٧ / ل ٤٢٧ ؛ محسن محمد حسین : صلاح الدین ، ل٧ .

(٦) مفرج الکروب ، ( ج١ / ل ٤ ) ، ( ج٢ /ل ١٣٧ ) ؛ کتاب السلوك ، ج١ / ل ١٤٨ - ١٤٩ .

(٧) و فیات الاعیان ، ج ٣ /ل ٥٢٤.

(٨) مفروج الکروب ، ج١ / ل٤ .

(٩) مەروان کوری محمد لەسالی (١٢٧ك / ٧٤٤ز ) بۆتە خەلیفە، ناسراوبووە بەمەروانی جعدی (الحمار) و ئەمەویەکان خۆشیان نەئەویست لەبەرئەوەی دایکی کورد بوو تا سالی (١٣٢ك/ ٧٤٩ز) فەرمانرەوا بووە ( المقدیسی: البداء والتاریخ ، ج٦ / ل٥٥ ، وفیات الاعیان ، ج٧ /ل١١١).

(١٠) لە الروضتین ، ج١ / ل ٢١٠ وەرگیراوە ..

پاشان ژمارەیەکی تر لەمێژوونوسان وای بۆ دەچن کە ئەم بنەماڵەیە دەچنەوە سەر رەچەڵەکی عەرەب لەوانە ( ئیبن خلدون ) دەیباتەوە سەر ( عوف الحمیر الدوسی ) و[1] یان دەیانکەن بە تورك[2] دیارە ئەمانە سەرجەم دروست کراون و هۆکاریش بۆ ئەم مێژوو نوسانە ئەوە بوو، کە باپیری شادی نەناسراوە[3]. لەلایەکی ترەوە بۆچوونی ئەوانە لە گێرانەوەی ئەیوبیەکان بۆ سەر رەگەزی عەرەب لەوکاتەوە دەست پێ دەکات، کە ئەندامانی ئەم بنەماڵەیە بوونە خاوەنی دەسەلاّت و بناغەی دەوڵەتیان دامەزراند. هەروەها سەبارەت بەو بۆچونانە ( ئیبن شەداد ) دەڵێت : سوڵتان ( سەلاحەدین ) خۆیشی گوێ بیستی ئەوەبووە کە چۆن هەندێك کەس و لایەن رەچەڵەکیان بردۆتەوە سەر رەگەزی عەرەب ، بۆیە سوڵتان ( سەلاحەدین ) نکوڵی لەمە دەکات و دەڵێت: "هەرگیز گەڕانەوە بۆ ئەو رەگەزە شتێکی راست نییە" [4] لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون سەبارەت بە رەگ و رەچەڵەکی ئەم تیرەیەو ساغ کردنەوەی وەك کوردی رەسەن ، بەتەواوی ئەنجامدراوە[5]، چونکە زۆر لە مێژوونوسانی رەسەن دانیان بەکوردییەتی ئەم بنەماڵەیەدا ناوە وەك ( ئیبن ئەثیر ، ئیبن خەلەکان ، مقریزی ، ئیبن تغری بەردی ، یونینی ، ئیبن عماد حەنبەلی ، ئیبن فورات ، ئیبن وردی ، ئیبن العبری ، ئیبن کثیر ، ذهبي و گەلێکی تر )[6].

سەربارى ئەم راستیانەش باوکی، کە شادییە و وشەییەکی کوردییەو بەمانای خۆشی و شادی دێت، سەرەڕای ئەمانەیش لەشوێنی نیشتەجێ بوونی یەکەمیان بۆمان دەردەکەوێت، کە لە بنەڕەتدا کوردن، کەواتە ئەو بەڵگانەی کوردبوونی ئەم بنەماڵەیە دەسەلمێنن، بەهێزترن لەو بیروبۆچوونانەی، کە رەچەڵەکیان بۆ سەر میللەتانی دی دەبەنەوە .

---

(١) العبر في ديوان المبتدا والخبر ، ج٥ / ل ٢١٨

(٢) عبدالعزيز سيد الاهل: ايام صلاح الدين ، ل ٣٤ .

(٣) و فيات الاعيان ، ج٧ / ل ١٤٠ .

(٤) لە ( هـ ـ س ، ج٧ / ل١٤١ وەرگیراوە .

(٥) حمە کریم عارف : کورد لە ئەنسکلۆبیدیای ئیسلام دا ، ل ٥٩.

(٦) الكامل، ج٧/ ل٢٠٠؛ وفيات الاعيان ،ج٧ /ل١٣٩؛ (خطط، ج٢/ ل٣٧٨، كتاب السلوك، ج١ / ل١٤٨، المواعظ والاعتبار، ج٢/ ل٢٣٣، اتعاظ الحنفا، ج٣/ ل٣٠٥)؛ النجوم الزاهرة، ج٦/ل٤؛ ذيل مراة الزمان، ج١/ ل٣٧؛ شذرات، ج٤/ ل١٨٦؛ تاريخ ئيبن الفورات ، مجلد٤ / ج١/ ل٥١؛ تتمة المختصر في اخبار البشر، ج٢/ل١١٦؛ مختصر تاريخ الدول ، ل٢١٢؛ البداية والنهاية ، ج١٢/ ل٢٥٩؛ سير أعلام النبلاء ، ج١٥/ ٢٧٢.

## چـوارەم خێـــزانـــەکـــەی

### ١. / بـــاوکــــی :

ئەو سەرچاوانەی لەسەر ژیـانی شـێرکۆیان نووسـیوەو باسـیان لێـوە کـردووە، زانیـاری تەواو لەبارەی خێزانەکەی و باپیرانیەوە نـادەن بەدەستەوە، چونکـە نادیـارەو دەنگ و باسیان تەم و مژاوی و لێڵە، لەبەرئەوە ئەوەندەی بۆمـان بکرێـت لـێرەدا تیشـك دەخـەینە سەر ئەندامانی خێزانەکەی ، ئەو خێزانەی رۆڵیان لــە رووداوە سیاسـی‌یەکانی ئەو سەردەمەدا بووە .

باوکی ناوی شادی کوڕی مەروانە ، [1] .شـادی شـوێنی لـەناو بنەماڵەکـەیدا ، مـیری گوندەکەی ( ئەجدانقان ) بووە [2] ( شەرەفخان ) یـش دەڵـێت : "بـە رەگـەز دەچێتـەوە سـەر پادشایانی شەدادی کوردو لە گەورە پیاوانی رەوادی بووە" [3] .

دەربارەی ئەم کەسیەتیە زانیاری کەمـەو تەنـها بیسـتنی ناوەکەیـەتی، لـەبارەی خەسڵەتەکانی ژیانی‌یەوە هیچ نازانرێت و مێژووی باوو باپیرانیشـی ناناشـکرایە. چـەند سەرچاوەیەك ناوی دەهێنن ئیتر لەناوی باپیریانەوە هەواڵێکی ئەوتۆ نەزانراوە.

کاتێك بەهرۆز لەلایەن سوڵتانەوە ( شحنە )ی بەغدادی پــێ دەسـپێردرێت [4] شـادی کوڕانی خۆی بۆ بەغداد بردووە، پاشان بەهرۆز کەسی لە شـادی بەشـیاوتر نـەزانیوە بـۆ پـاراستنی قەلای تکریت و پێی سپاردووە [5] ، ئەوە هــۆی گیرسـانەوەی شـادی بـووە لــە تکــریت و هـەر لـــەناو ئـەم شارەشـدا بـەخاك سـپێردراوە [6] ، چونکـە خـاوەنی رێــزو خۆشەویستی خەڵکی شارەکە بووەو گومەزێکیش بەسەر گۆڕەکەیەوە دروست کراوە . [7]

---

(١) کتاب السلوك ، ج١ / ل ٤١ ؛ وە (ئیبن ئەبی طي) دەڵێت ( مەروان کوڕی یعقوبە ) وەرگیراوە لە ( الروضتین ، ج١ /ل ٢١٠ )

(٢) وفیات الاعیان ، ج١ /ل ٢٥٥ .

(٣) شەرەف نامە ، ل ١٢٤ .

(٤) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە بابەتی (لەدایکبوونی شێرکۆ) لە (باسی یەکەم)دا.

(٥) البدایه والنهایه ، ج ١٢ /ل ٢٩٩ .

(٦) ذیل مراة الزمان ، ج١ ل ٣٨ ؛ الدارس في التاریخ المدارس ، ج٢ / ل ١٧٥.

(٧) الروضتین،ج١/ل٢١١؛ وفیات الاعیان، ج٧/ل١٣٩؛ شفاء القلوب، ل٢٣.

## ٢. بـــراكـــــەی

### نـــەجمـــەديـــن :

نەجمەدين كوڕی شادی لە گوندی ( ئەجدانقان ) ی بەردەم شـــاری ( دويــن ) دا لـــە دايك بووە[١]، پيـاوێكی جوامێرو سەر راست بووە ، دوای مردنـــی بـــاوكی لەجێگـــەی بـــاوكی دانراوەو بۆتە لێپرسراوی قەلاكە لە تكريت.[٢]و بەتەمەن لە شێركۆ گەورەتر بووە[٣].

گەلێك لەسەرچاوەكانی مێـــژوو ، زۆر بـــەچاكی دەربـارەيـــان نووســيوەو دەڵێــن : پيـــاوێكی ديندارو چاوتێرو خێرەومـــەند بـــووە، زانـايـــانی خـــۆش ويســـتووەو هاورێيـــەتی كردوون و لەخۆی نزيك كردونەتەوە ، كاروبـاری خۆی هۆشيارانە جێبەجێ كردووە، رێگـــرو چەتەی لە ناوچەكەدا نەهێشتووە، لەو سەردەمەدا خەڵكی گوزەرانيـان گەلێك بـاش بـــووە[٤] ، هەڵسو كەوتی لەگەڵ هەمووان جوان بووەو رێزی لێ گرتـوون.

رۆژگارێك هاتـە پێشەوە لەئەنجامی كوژرانی يـــەكێك لەلايـــەنگران و دۆســـتانی بەهرۆزدا ساڵی ( ٥٣٢ ك / ١١٣٧ز ) نيوانيـان تێكچوو ، و كـــار گەيشـــتە ئـــەوەی داوای جـــێ هێشتنی قەلاكەيان لێ كراوە[٥] ناچار روويـان كردە موصلْ بـــۆ لای عمـــادەدين زەنگـــی بـــەو هيوايـــەی داڵدەيـــان بدات، زەنگی زۆر رێزی لێ گرتن[٦] و زەوی و زاری بەبايـــەخی پێـــدان [٧]. نەجمەدين پەيوەندی بە سەيفەدين غازی كـــوڕی زەنگیيـــەوە كـــرد[٨]، دواتـــر لـــەناو ريزەكانی سوپای زەنگيدا كـــاری كـــردوەو لەگـــەلێك شـــەڕدا هاوبەشـــی كـــردوون و كـــاتێك ( بعلبك )[٩] لە سـاڵی ( ٥٣٤ ك / ١١٣٩ز ) كەوتە ژێردەستی زەنگـــی، بەنەجمـــەدينی ســـپاردو كرديية پارێزگاری[١٠]، وەك جێگری خۆی.

---

(١) الكامل ، ج٧ / ل ٢٠٠ ؛ شذرات ، ج٤ /ل ١٨٧ .

(٢) عماد الدين الاصفهاني: البرق الشامي، ج٣/ل٨؛ مفرج الكروب، ج١/ل٧.

(٣) الكامل ، ج٧ /ل ٢٠٠ ؛ تتمة المختصر في اخبار البشر ، ج٢ /ل ١١٧ .

(٤) الكامل، ج٧ / ل٢٠٠؛ كتاب السلوك، ج١ /ل٤٢؛ محسن محمد حسين: صلاح الدين، ل٧.

(٥) مفرج الكروب ،ج١ / ل ٨ ؛ النجوم الزاهرة، ج٦ /ل ٤ ؛ خطط ، ج ٣ /ل ٢٧٨ ؛ كارل بروكلمان : تاريخ الشعوب الاسلامية ، ل ٣٥١ .

(٦) الكامل ، ج٧ / ل ٢٠٠ ؛ شەرەفنامە ، ل ١٢٥ .

(٧) الروضتين ، ج١ /ل ١٢٩ ؛ النجوم الزاهرة ،ج ٦ / ل ٤ .

(٨) شفاء القلوب ، ل ٢٣ .

(٩) بعلبك : شارێكە لەخاكی شام لەسەر شاخ دروستكراوە بەبەردو كۆشكی زۆرو سەرنج راكێشی تيايە ، (معم البلدان ، ج١ / ل٤٥٣).

(١٠) ابن شداد : النوادر السلطانية ، ل ٦ ؛ الروضتين ، ج١ / ل ١٢٩ .

Steven son. The crusaders in the east P. 144.

نەجمەدین دەستی بەناوەدانکردنەوە کردو سەرەتا خانەقایەکی دروستکرد، دوای نەمانی خۆیشی ئەم خانەقایە بەناوی نەجمیەوە ناوبانگی دەرکردبوو [1].

نەجمەدین بەجێگری مایەوە تا ساڵی (٥٤١ك /١١٤٦ز) کە زەنگی کوژراو دەوڵەتەکەی لەنێوان هەردوو کورەکەیدا دابەشکرا [2]. لەو ماوەیەدا کورانی (طغتە کین)، کە فەرمانڕەوایی دیمەشق بوون بارودۆخەکەیان بەهەلزانی و ویستیان بەعلەبەك بخەنەوە ژێردەستی خۆیان و بۆ ئەم مەبەستە کۆششیان کردو گەمارۆیاندا [3].

نەجمەدین داوای کۆمەك و هاوکاری لە مەلیك غازی کوڕی زەنگی کرد کە فەرمانڕەوایی موسڵ بوو، لەو کاتەدا تازە دەستەڵاتی کەوتبووە دەست، بەڵام داواکەی جێبەجێ نەکرا [4]. لەم کاتەدا نەجمەدین لەو ڕاستییە گەیشت کە لەشکری قەڵا پارێز ناتوانن خۆیان بەرامبەر بە پەلاماردەران بگرن [5]، چونکە کورانی زەنگی سەرقاڵی کێشەی ناو خۆیان بوون و سەرەڕای کەم ناوی کە هێندەی تر برستی بڕیبوون، بەم هۆیەوە بیری لە ڕێکەوتن کردەوە لەگەڵیانداو بەوە ڕازی بوو کەناوچەیەکی دە گوندی [6] لە پاڵ دیمەشق دا [7] بدرێتێ بەرامبەر بەخۆ بەدەستەوەدانی شاری بەعلەبەك بەبێ شەڕ [8] بە (شجاع الدولە عطاء الخادم) [9]. ئینجا دواتر باری کردو چووە دیمەشق [10] و لەوێدا بەژیری و لێهاتوویی خۆی لە کوڕە گەورەی (طغتکین) نزیك کردووەتەوە کە ناوی ئیبك بوومو خەڵات و پاداشی باشی لێ وەرگرتووە [11] و پلەشی گەشتە سەرلەشکری هێزەکانی شام و بوو بەیەکێك لە میرە ناودارەکانی دیمەشق [12].

---

(١) المواعظ والاعتبار، ج٢ / ل ٢٣٣ ؛ شذرات، ج٤ / ل ٢١٧ .

(٢) ابن العديم : زبدة الحلب، ج٢ / ل ٢٨٩ ، Zoeolden bourg . The crusadders .P.321

(٣) تاريخ ابن الفرات، مجلد ٤ / ج١ / ل ٥٢ ؛ العبر في ديوان المبتدا ء والخبر، ج٥ / ل ٢٧٨ .

(٤) تاريخ الباهر، ل ١١٩ .

(٥) الروضتين، ج١ / ل ١٢٩ .

(٦) تاريخ الباهر، ل ١٢٠ ؛ السيدالباز العريني: الشرق الاوسط والحروب الصليبية، ج١ / ل٥٢٥ .

(٧) دمشق : لای ڕۆمەکان ناوی شاری دمسکوس بووەولای خاچپەکانیش داماس بووە ، ئەبوفیداش بە غوطەی شام ناوی بردووە، (معجم البلدان، ج٢ / ل٤٦٣؛ صلاح الدين المنجد: مدينة دمشق، ل٢١٢).

(٨) مفرج الكروب، ج ١ /ل ١١٠ ؛ تتمة المختصر في اخبار البشر، ج٣ / ل ٦٧ – ٦٨.

(٩) الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام، ل٤٧.

(١٠) المختصر في اخبار البشر، ج٣ / ل١٩، محسن محمد حسين : صلاح الدين، ل١٠.

(١١) الكامل، ج٧ / ل٢٠٠ ؛ احمد بيلي: صلاح الدين، ل٦٤.

(١٢) شفاء القلوب، ل٢٤؛ عمر موسى : ادب لحروب الصليبية، ل٣٦.

دەبێت ئەوەش بزانین پێش گەیشتنی بەم پلەوپایەیە ، ڕۆڵێکی کاریگەری گێڕاوە لە کاتی گەماڕۆدانی دیمەشق دا لەلایەن خاچیەکانەوە بەتایبەتی لەهەڵمەتی دووەمیاندا لە ساڵی (٥٤٣ ك / ١١٤٨ ز)[١].

لە سەردەمی (معین الدین أنر)دا ، کە کۆچی دوایی کرد نەجمە دین گەیشتە پلەی سەرکردایەتی[٢]، لەم کاتەدا نورەدین محمود بۆ دروستکردنی بەرەیەکی بەهێز لە شام و لێدانی بنکەی خاچیەکان بیری لەگرتنی دیمەشق دەکردەوە. ئەم کارەشی بە شێرکۆ سپارد ، کە سەرلەشکری حەلەب بوو وە لەساڵی (٥٤٩ ك / ١١٥٤ ز) هاتە سەر دیمەشق[٣] ئەوەی ڕویدا کارێکی ئاسان نەبوو، پاش ڕێکەوتنی هەردوو برا (ئەیوب و شێرکۆ) نورەدین شاری دیمەشقی کەوتەوە دەست[٤] ، پاشان شێرکۆ براکەی نزیك خستەوە لە نورەدین[٥]، بەم کارە بوو بەیەکێك لە میرە گەورەکانی دیمەشق و خاوەن ڕێز لای نورەدین[٦]. لەکۆڕی ئەودا ئەیوب نەبێت کەس بۆی نەبوو دابنیشێت و فەرمانڕەوایی شاری دیمەشقی دایە دەست[٧].

بەم جۆرە زۆربەی ژیانی لەشام لەناو گەورە پیاواندا بەسەر برد، ساڵی (٥٦٥ك/ ١١٦٩ ز) کە کوڕەکەی سەلاحەدین لە میسر بوو بەوەزیری خەلیفە (عاضد)ی فاطمیەکان نورالدین ئەیوبی بەڕێ کرد[٨] و نامەیەکی دایە بۆ سەلاحەدین، تا ئاواتی خەلیفەی عەبباسی (ئەلموستە نجد) بەدی بهێنێ بەخوێندنەوەی ناوی لەخوتبەی ڕۆژی هەینیدا لە (قاهیرە) لەگەڵ گەیشتنی بۆ میسر، خەلیفە (عاضد) پێشوازی لێکرد[٩] و نازناوی (شیاوترین شای) (الملك الافضل) پێداو لەنزیك کۆشکەکەی خۆیەوە خانوویەکی بۆ تەرخان کردو دیاری نایابی بۆ ناردە ئەسکەندەریەو دمیاط و بحیرەشی لە قەبەڵ کرد، پاشان سەلاحەدین بەگەرمیەوە پێشوازی لێکرد[١٠] ئەیوب کرایە سەرپەرشتیاری هەڵسوراندنی دارایی دەوڵەت و ڕاوێژکاری یەکەمی سەلاحەدین[١١] .

---

(١) الیافعي: مراة الجنان ، ج٣/ ل٢٧٧؛ سعید عاشور: الحركة الصليبية ، ج٢ / ل٦٣٥؛ محمد امین زكي : مێژووی کوردو کوردستان ، ج٢ / ل١١٩

(٢) المختصر في اخبار البشر ، ج٣ / ل١٩ ؛ اتعاظ الحنفا ، ج٣ / ل٣٠٦ .

(٣) ابن قلانسي: نيل تاريخ مدينة دمشق ، ل٣٢٠؛ تاريخ الباهر ، ل١٢٠ ؛ محمد كرد على: خطط الشام ، ج٢ / ل٢٩.

(٤) الصدفي : تاريخ الاسلام، ل١٨٦؛ رانسيمان: الحروب الصليبية ، ج٢/ ل ٥٤٩ : السيدالباز العريني : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل٥٩٦ ـ ٥٩٧

(٥) الروضتين ، ج١ / ل١٠٠

(٦) مختصر تاريخ الدول ، ل٢٠٣ ؛ سير اعلام النبلاء ، ج١٥ / ل٢٧٣ .

(٧) الروضتين ، ج١ / ل١٠ ، ١٠٠ .

(٨) شفاء القلوب ، ل٤٥ ؛ شاكر أحمد ابو بدر : الحروب الصليبية و الاسرة الزنكية ، ل٢٩٧ .

(٩) سير اعلام النبلاء ، ج١٥ / ل٢٧٣

(١٠) الروضتين ، ج١ / ل١٨٢

(١١) النجوم الزاهرة ، ج٦ / ل٦ـ٧ .

ژیانی بەخۆشی بەسەر برد تا ساڵی ( ٥٦٨ ك ـ ١١٧٢ ز ) . لەبەردەم قاهیرەدا لە ڕۆژی دوو شەممەی ١٨ ی ذي الحجة دا لەسەر ئەسپ دەگلێت و بەسەردا دەکەوێتە خـوارێ[١] . لە ڕۆژی سێ شەممە ڕێکەوتی ٢٧ ی ذي الحجة دا کۆچی دوایی کردووە[٢] و لە قاهـیرە بـە خاك سپێردراوەو ، دوای ( دە ) ساڵ تەرمەکەی گواستراوەتەوە بۆ شاری ( مەدینە ) ی پـیرۆز[٣] و لە دوای خۆی شەش کوڕو دوو کچی جێ هێشتووە[٤] .

---

(١) شفاء القلوب ، ل٤٥ .

(٢) الروضتـين ، ج١ / ل ٢٠٩ ؛ وفيـات الاعيـان ، ج١ / ل٢٢٦ ؛ العبر في خـبر مـن غـبر ، ج١ / ل٢٠٢ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٦ / ل٧٦ ؛ شذرات ، ج٤ / ل٢٢٦ .

(٣) سير اعلام النبلاء، ج١٥/ل٢٧٣؛ الدارس في تاريخ المدارس، ج٢ / ل١٧٤.

(٤) ئەمەش ناوی کوڕەکانیەتی :ـ

| | |
|---|---|
| ١.مظفرالدين موسى. | ٢. سيف الاسلام توغتكين. |
| ٣. ملك ناصر سەلاحەدین. | ٤. ملك عادل سيفالدين ابوبكر محمد. |
| ٥. شمس الدين تورانشاه . | ٦. نورالدولة شاهەنشاه |

ئەمەش ناوی کچەکانیەتی :

| | |
|---|---|
| ١. ست الشام. | ٢. ڕەبیعە خاتون . |

( المرتضى الذبيدي : ترويح القلوب في ذكر ملوك بني ايوب ، ل٤٢ — ١١١ )

## ٣. کـــــوڕەکــــانـــــــی

سەرچاوەکانی مێژوو دەربارەی کوڕێکی بـەناوی ( فە تحـەدین ) ەوە شـتێکی ئـەو تۆیان نەنوسیوە تەنها ئــەوەندە نـەبێت کـە دەڵێـن : فە تحـەدین کـوڕی شـێرکۆ بـرای ناسرەدین ، لە ساڵی ( ٥٦١ك / ١١٦٥ ز ) ی کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی نەجمیە لە پاڵ گۆڕی ئامۆزاکەیدا ( شاهەنشاە کوڕی ئەیوب ) لە دیمەشق بە خاك سپێردراوە [١] .

وە عەرقەلەی کوڕی کەلبی شاعر ئــەم پارچـە هۆنراوەیـەی بـۆ هۆنیوەتـەوە و دەڵێت :

| | |
|---|---|
| لـلـــه شبـــلا اســـد خـــادر | مـا فيهمـا جـبن ولا شـــح |
| مــا اقبـلا الا و قــال الـــوري | قـد جـاء نصرالله و الفتح [٢] |

---

(١) الروضتين ، ج١ / ل١٤١ ؛ الدارس في تاريخ المدارس ، ج٢ / ل٢٩٩ .

(٢) حسان بن نمير : ديوان عرقلة الكلبي ، ل١٩

| | |
|---|---|
| ( ئای لەو دوو بەچکە شێری لانە | هەرگیز ترس و ڕەزیلیان تێدا نی‌یە |
| بەهاتنی ئەو دووانە بۆ گۆڕەپانی | شەڕ سەرکەوتن دەستەبەر دەبوو ) |

بەلام ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە شێرکۆ دوای خۆی تەنیا کوڕێکی بەجێ هێشتووە ناوی ( ناسرەدین موحەمەد ) بووە و بە ( مەلیك القاهر ) ناسراوە [1] .

لەبەڕێوەبردنی شاری ( حمص )دا جێگری باوکی بووە[2] ، لەژیانیدا سوارچاکێکی نازاو چاونەترس و چوست و چالاك بووە [3]. دوای مردنی شێرکۆ لە میسر سالی ( ٥٦٤ ك – ١١٦٨ ز ) بەچەند مانگێك نورەدین ئەو ناوچانەی ، کە بەشێرکۆی دابوو لەمانگی ڕەجەبی ئەو سالەدا دەستی بەسەردا گرتنەوەو لێی وەرگرتەوە [4]. حالّ بەم شێوەیە مایەوە تا سالی ( ٥٧٠ ك – ١١٧٤ ز ) ئەو ناوچانە کەوتنە ژێر دەستی سەلاحەدین و گێڕانیەوە بۆ ناسرەدین موحەمەد کوڕی شێرکۆ [5] بێجگە لە زەوییەکانی ( ڕەحبە )ش[6] ناسرەدین ئامۆزاو زاوای سەلاحەدین بووە [7].

لە لاپەڕە پرشنگدارەکانی مێژوودا بێ بەش نەبووە ، لە هەلمەت بردنە سەر دوژمنان پالەوانیەتی نواندوەو وەك باوکی میرخاس و جوامێربووە ، بۆ نموونە کۆمەلێك لە خاچیەکان لەسالی ( ٥٧٤ ك – ١١٧٨ ز ) ی دا دەکەونە تالانی و کوشتن و دیلکردن و ئازاردانی دانیشتوانی دەوروبەری شاری ( حمص ) ، ئەم کەلەمێردە ڕێگای گەڕانەوەیان لێ دەگرێت و بۆسەیەکیان بۆ دەنێتەوە بەزمانی شمشێر وەلامیان دەداتەوەو زۆربەیان دەکوژرێن و ژمارەیەکیان لێ بەدیل دەگرێت و ئەوەی ڕزگاری بووە بەزامداری بووە، سامانی خەلکە تالانکراوەکانیش بۆ خاوەنەکانیان دەگێڕێتەوە [8].

زۆر حەزی بەدەسەلات و پلەو پایەی بەرز بووە[9]، سولتان سەلاحەدینی ئامۆزای زۆر ڕێزی لێ دەگرت و سلی لێ دەکردەوە، چونکە هەمیشە دەیگوت: "دەسەلات بۆ من ڕەواترە لە سولتان " ئەمەش بەرگوێی سولتان دەکەوتەوە ) ) [10]،

تا کار گەیشتە ئەوەی ناسرەدین بیر لە کورسی دەسەلات بکاتەوەو پلانی بۆ دابڕێژێت . کاتێك سەلاحەدین لەسالی ( ٥٨١ ك – ١١٨٥ ز ) ی دا نەخۆش دەکەوێت ئەم لەشاری ( حەران ) [11] لای سولتان دەبێت [12] .

---

(١) وفيات الاعيان ، ج٢ / ل٤٨٠ ؛ شفاء القلوب ، ل٤٨ .

(٢) العبر في خبرمن غبر، ج٤ / ل١٨٧ ؛ الدارس في تاريخ المدارس ، ج١ / ل١٥٢.

(٣) الصفدي : الوافي بالوفيات ، ج٣ / ل١٥٤ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٦ / ل١٠٠؛ شذرات ، ج٤ / ل٢٧٣ .

(٤) وفيات الاعيان ، ج٢ / ل٤٨٠ .

(٥) الكامل، ج٧/ ل٢٠٠؛ القلقشندي: ماثر الاناقة في معالم الخلافة، ج٢ / ل٦٤.

(٦) الكامل، ج٧/ ل٣١٤؛ السيد البازالعريني: الشرق الادنىو الايوبيون، ل١٦٢.

(٧) الكامل ، ج٧ / ل٣١٤ ؛ ترويح القلوب ، ل٣٨ ؛ محمد كرد علي : خطط الشام ، ج٦ / ل٨١ .

(٨) الاصفهاني : البرق الشامي ، ج٣ / ل٧٢ ؛ الكامل ، ج٧ / ل٢٧٣ .

(٩) شذرات ، ج٤ / ل٢٧٣ .

(١٠) النجوم الزاهرة ، ج٦ / ل١٠٠ ؛ شفاء القلوب ، ل٤٨ .

(١١) حەران : شارێکی کۆنە لە دیاری موصل لە سنوری شام ( معجم البلدان ، ج٢ / ل٣١٧ ) .

(١٢) الكامل ، ج٧ / ل ٣١٤ .

له گەڕانەوەی دا بەشاری ( حەلەب ) دا تێدەپەڕێت و لەگەڵ پیاوماقوڵان گفتوگۆ دەکات و پارەوپوول و خەڵاتی باشیان دەداتێ و لەگەڵ گەیشتنەوەی بۆ شاری حمص بەخێرایی پەیوەندی بەدەستەیەك لە کاربەدەستانی دیمەشقەوە دەکات ، تا بەڵێنی بدەنێ لەدوای کۆچی دوایی سەلاحەدین دەسەڵات بگرێتە دەست. بۆ ئەو مەبەستە لەشاری حمص مایەوەو چاوەڕێی مردنی سەلاحەدینی دەکرد [1] ، تا ببێتە فەرمانڕەوای شام ، [2] ئەم دەنگو باسەش گەیشتەوە بە سەلاحەدین. زۆری پێ نەچوو سەلاحەدین چاك بووەوە، بەلام ناسرەدین لە ڕۆژی عەرەفەدا ، کە شەوەکەی جەژنی قوربان بوو کۆچی دوایی کرد [3] ،

دەڵێن : " لەئەنجامی خواردنەوەی مەشروبی زۆردا مردووە" [4]. وە هەندێك دەڵێن : گوایە ژەهرخواردوو کراوە ، لەڕێی کەسێکەوە لەلایەن سەلاحەدینەوە دانراوەو ناوی ( ناسح کوری عەمید بووە ) [5] و خەڵکی شاری دیمەشق بووە ، ئەو شەوەی ژەهر خواردوی کردووە لەگەڵی دا بووەو دیار نەماوە ، کە پرسیاریان کردووە لەکوێیە ؟ وتویانە هەر ئەو شەوە چۆتەوە لای سەلاحەدین ئەمەش گومانەکەی بەهێزتر کردووە [6]. پاشان ژنەکەی ( ست الشام ) کە لەدایك و باوکەوە خوشکی توران شاه بوو [7] تەرمەکەی بردۆتەوە بۆ نزیك دیمەشق بۆ خاکی خۆیان و لە مەدرەسەی شامیە لای گۆڕی برای خۆی توران شاه کوری ئەیوب نێژراوە [8]. کوڕەکەی بەناوی شێرکۆی دووەم ، کە ئەو کاتە تەمەنی دوانزە ساڵ بووە چووەتە شوێنەکەی [9].

ناسرەدین محمد پیاوێکی زەنگین بووەو سامانێکی زۆری لە پاش بەجێ ماوە، بەشی زۆرو بەنرخی میراتەکە بۆ الحسامیەی ژنی ناسرەدین بووە، کە یەکێك بوو لە خوشکانی سەلاحەدین، ئەوەی مایەوە لەنێوان کوڕو کچەکانیدا دابەشکراون ، میراتیەکەش پێکهاتبوو لە سامان و موڵك، کە بەهەزارهەزار دینار مەزەندە کراوە [10].

---

(١) شفاء القلوب ، ل٤٨ .

(٢) رانسيمان : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل٧٢٠ .

(٣) الوافي بالوفيات ، ج٣ / ل١٥٤ : النجوم الزاهرة ، ج٦ / ل١٠٠ ؛ البداية والنهاية ، ج١٢ / ل٣١٧ .

(٤) شذرات ، ج٤ / ل٢٧٢ .

(٥) الكامل ، ج٧ / ل٣١٤ ؛ شفاء القلوب ، ل٤٨ ؛ السيد الباز العريني : مؤرخوا الحروب الصليبية ، ل٢٢٨ .

(٦) الكامل ، ج ٧ / ل٣١٤ .

(٧) البداية والنهاية ، ج١٢/ ل٣٢٧؛ محمد كرد علي: خطط الشام ، ج٦/ ل٨١.

(٨) وفيات الاعيان ، ج٢ / ل٤٨٠ : شفاء القلوب ، ل٤٩ ؛ ترويح القلوب ، ل٣٧ .

(٩) الذهبي: كتاب دول الاسلام، ج٢ / ل٦٧ ؛ الحروب الصليبية ، ج٢ /ل٧٢٠.

(١٠) كتاب دول الاسلام، ج٢/ ل٦٧؛ السير هاملتون جب: صلاح الدين ، ل٨٩ -٩٠.

هەندێك لە سەرچاوەكان دەڵێـن : سـەلاحەدین بەشـێك لەمیراتەكـەی بۆخـۆی بردووە[1] ، بەڵام ( رانسیمان ) دەڵێت : ئەوەی بردویەتی دواتر بۆی گێراونەتەوە[2].

لێرەدا ئەم پارچە هۆنراوەی حەسان كوڕی نمیر ، كە پیا هەڵدانە بۆ ناسـرەدین محمد دەخەینە بەرچاو كە دەڵێت:

| | |
|---|---|
| امالي على الاحباب يا سعد مسعد | ولا منجـد لا اغـــاروا وا نجـــدوا |
| عذرت العذاري في صـدوري و لم | اقل خليلي لم احضى من البيض اسود |
| لناصر الدين اللـه النصر علـى | العـــدي و عـزم حكاه المشرفي المهند |
| و ناران للحرب العوان و للقـرى | غدت كل نـــار منهـــما تتوقد [3] |

---

(١) الكامل ، ج٧ / ل٣١٥ ؛ شفاء القلوب ، ل٤٩ .

(٢) الحروب الصليبية ، ج٢ / ل٧٢١ .

(٣) ديوان عرقلة الكلبي ، ل٢٨ – ٢٩

( شتێكم نیە بەسەر خۆشەویستەكانەوە دڵخۆشكەر بێت
پشتگیرو لە بری شالاوو یارمەتی دەربێت
خۆم بیانوم دۆزیوەتـــەوە خۆشـــەویستەكەم
لەبەرچی لەجیاتی شێر بووە بە شمـشێر
سەركـەوتن بۆ ( ناسرەدین )ە بەسەر دوژمنـانا
شـــمـشێـری مـوشـــریـــفـــی نـاسـا
دوو ئاگری هەیە بـــۆ جـــەنـــگ و میوان
هەردوكیان بـــەردەوام لـــە بڵێسەدان )

## بەشـی دووەم

## خەسڵـەتەکـانـی شـێرکـۆ

### یەکـەم - جـوامێریی

شێرکۆش وەك رۆڵەیەکی کورد لەسەرجەم سەرچاوە مێژوویـیـەکاندا، وەك کەڵـە مێردو شۆڕەسواری ئیسلام لەسەردەمی خۆیدا نمونەیەکی رەزاسووکی جوامێری بووە. ژیـری و مێرخاسی و چاونەترسی ئەو ببوە مایەی سەرکەوتنی، تـا پلەی سەرەك وەزیرانی لە میسـر وەرگرت، ئـازایی شێرکۆ کەم وێنە بووەو ئەو لەشکرەی ئەو رابـەرو رێکخـەری بـووبێـت لـە زۆربەی شەرەکان دا سەرکەوتنی بەدەست هێنـاوە [1]

جێی رامان نیە، کە خاچیەکان تەنانەت لە ناوو نـاوبـانگی ترساون [2]، لە هـەر هەڵمەتێکی سوپای نورەدین بۆ سەر خاچیـەکان و شـکاندنی دوژمـن و چاوترسـاندنیان و رزگارکردنی قەڵاو قوڵلەی ژێردەستەڵاتیان هۆیەکـەی یەکسـەر دەگەڕێتـەوە بـۆ توانـای شێرکۆ [3]. خاچیەکان بەووردی گوێ بیسـتی نـاوبـانگی ئـەوبوون، ئـەمالریك کەمـەلیکی خاچیەکان بوو لەقودس لەساڵی (٥٦٤ك / ١١٦٨ز)ی دا دەڵێت: ئەگەر میسر بکەوێتە دەست سەرکردەیەکی وەك شێرکۆ ئەوا فەوتـانی خـاچیـەکان و وەدەرکردنیـان لـەووڵاتی شـام دا ئاشکرایە [4].

لێرەدا ئەم دێرە هۆنراوەیەی عمادەدین کاتب وەردەگرین کـە بـۆ ئـەم مەبسـتە دەڵێت:

كانوا من الرعب موتى في جلودهم        وحين أمنتهم من خوفهم نشروا [5]

نموونەیەکی تـری ئازایـەتی شـێرکۆ ئەوەیـە، کەنزیکـەی سـێمانگ خـۆی و سوپاکەی لەشاری بلبیس [6] گەمارۆ درابوون، هەرچەندە شورای شارەکە نزم بوو لە قوڕیـش دروست کرابوو، بەڵام دوژمن نەیتوانی بچنە ناو شارەکەوە بـەهۆی ئـەو ترسـەی کـە لـە شێرکۆیان هەبوو، ئازایەتی شێرکۆ وەك نموونەی داستان باسکراوە [7].

---

(١) الكامل ، ج ٧ /ل٢٠١: الروضتين ، ج١ /ل ١٦٦ .

(٢) سير أعلام النبلاء ، ج١٥/ ل٢٧٢: حسين مونس: نورالدين محمود، ل٢١٧.

(٣) تهذ يب تاريخ دمشق الكبير ، ج٦ / ل ٣٦٠ ؛ شفاء القلوب ، ل ٢٥

(٤) الروضتين ، ج١ / ل ١٥٤ ؛ وفيات الاعيان ، ج٢ / ٤٤٦ .

(٥) لە الروضتين ، ج١ / ل ١٤٥ وەرگیراوە

( هەموویان وەك مردوو بوون لەناو پێستیانا بەڵام کەخۆش بویت لێیان زیندوو بوونەوە )

(٦) بلبیس: شارێکە لەسەر رێگەی شام نزیکەی٦٠کم لەشاری فسطاط دوورە (معجم البلدان ، ج١ / ل٤٧٩).

(٧) شذرات ،ج ٤ / ل ٢١١ .

زۆر نازناوی بەهۆی ئازایەتی‌یەوە بەسەردا بڕاوە ، هەر لەسەرەتای لاوێتی‌دا ئەو کاتەی لای عیمادەدین زەنگی بوو توانی بەئازایەتی خۆی پلەی سوپا سالار بە دەست بهێنێ[1]. لای نورەدین بووە یەکەم ناوداری سوپا ، جەربەزەیی ئەم کەڵەمێرە سەرنجی ( نورەدین ) ی بەشێوەیەك ڕاکێشابوو ، کە بیکاتە گەورەترین میرو پلەی هێندە بەرز بێت ، وەك هاویەش لە فەرمانڕەواییدا هەڵس و کەوت بکات[2] و پێشەوای لەشکریش بێت .هەمیشە لەشەڕەکانی‌دا یاوەری نورەدین بوو[3]. لەساڵی ( ٥٤١ك - ١١٤٦ ز ) دا ڕزگارکەری دەوڵەتی بوو[4] لەبەر ئەم هۆیانە نورەدین شێرکۆی لە خۆی نزیك کردەوەو دەیزانی، کە هەرگیز ترس پەی پێ نابات و گیانی لە پێناوی غەزادا لەسەر دەست بوو[5] کەواتە ( ئەبو شامە ) ڕاستی ووتووە " کە ئازاترین سەرکردەیە لەناو هەموو سەرلەشکرەکانی شامدا "[6].
لێرەدا دێرێ هۆنراوەی ( عماد ) دەنوسین کە ستایشی ئازایەتی شێرکۆیە :

و روستم خبرونا عن شجاعته          و صار فيك عيانا ذلك الخبر[7]

( ئیبن فورات ) دەڵێت : بەهۆی شێرکۆوە سەرەتای دەوڵەتی شادی دەستی پێ کردووە[8]، ئەم زاتە سەرجەم سیماکانی سەرکردەی سەرکەوتووی تێدا بووە، وەك پشوو درێژی و خۆڕاگری ، کە ئەمانە کاری مەزنن بۆ ئەنجامدانی سەرکەوتنی سەربازی.
( ولیم صوری )[9] بەشێوەیەك باسی دەکات و دەردەکەوێت کەچەند سەرنجی ڕاکێشاوەو دەڵێت: "لەگەڵ تەمەن زۆریدا پیاوێکی لەش سووك و بەتواناو بەئارام بووە ، لەکاتی تەنگانەدا خۆڕاگربووە بەتایبەتی لەکاتی برسێتی و تینویەتی و ماندویەتی‌دا"[10]. زۆر بەڕێزەوە جێگەی خۆی لەدڵی پیاوەگەورەکانی سەردەمی خۆیدا کردۆتەوە، دەبێت ئاماژە بەوە بدەین ،کە ئەو یەکەم سەرکردەیە سوپای میسرو شامی یەکخست[11]،بەمەش بناغەی دەوڵەتی شادی ، کە دایمەزراندبوو کردە بناغەیەکی پتەوی دەوڵەتی ئەیوبی لە میسر[12].

---

(١) تاريخ ابن الفرات، مجلد٤ / ج١ / ل٥٢؛ جرجي زيدان : صلاح الدين ، ل٧.
(٢) تاريخ الباهر ، ل١٦٨ .
(٣) تتمة المختصر في اخبار البشر ، ج٢ / ل١١٧ ؛ السيد الباز العريني : الحروب الصليبية ، ج١ / ل٦٦٧ .
(٤) الروضتين ، ج١ / ل٤٨ .
(٥) الكامل، ج٧/ ل١٧٢؛ شفاء القلوب، ل٢٥، هەندێ سەرچاوەی تازەش واباس دەکەن کە لەکاتی شەڕدا شێرکۆ چاوێکی خۆی لەدەست داوە. (حسين مؤنس: نور الدين محمود، ل٣١٧؛ السيد البازالعريني : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل٦١٩ )

(٦) الروضتين ، ج١ / ل١٣٠ .

(٧) هـ . س . ( باسـى ئازايـەتى ڕۆسـتەميان بـۆ كردويـن بـەڵام ئـەو باسـە لـەتۆدا بـووە بەدياردەيەكى ئاشكرا )

(٨) تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل٥٠ .

(٩) وليم صوري: گەورەی شەماميسەی شاری صور بووە، مێژوونوسێكی سەردەمی خۆی بووە، نێردراوی ( ئەمالريك ) بووە بۆ لای ( مانويل ) ئيمبراتۆری بيزەنتی ساڵی ١١٦٨ز بۆ گرتنی ميسر. ( رانسيمان: الحروب صليبية، ج٢/ ل٦١٢).

(١٠) وەرگيراوە لە السيد البازالعريني : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل٦٦٧ .

(١١) النجوم الزاهرة ، ج٦ / ل٦ ؛ احمد بيلي : صلاح الدين ، ل٨٤ .

(١٢) تـاريخ ابـن الفـرات ، مجلـد٤ / ج١ / ل٥٠؛ سـيد علـي الحريـري: اخبـار السـنية و الحـروب الصليبية ، ل١٣٦ .

لەگەڵ ئەم پێشەوایەتییەدا بۆ مەبەستی خۆی کاری نەکردووە، بەڵکو لە پێناوی بیروباوەڕی ئیسلامداو سەرکەوتنی ئەو پەیامەدا چالاکی نواندووە، زیاد لە بیست ساڵ وەك سەرکردە لەشەڕدا بەشداری کردووە ، بێئەوەی مەرامێکی تایبەتی هەبێت یان سەرمایەیەکی پێکەوە نابێ تەنانەت بۆ چالاکیە سەربازییەکانی باربۆی کۆکردۆتەوە [1] .

ئەو کەسیەتییە خاوەن ئەزمونێکی زۆربووە لەبواری سەربازی دا، وەك کەسێکی دنیا دیدەو کارامە شارەزای فرتو فێلی شەڕ بووە. ئەم خەسڵەتانە نورەدینی هاندا زیاتر باوەڕ بەشێرکۆ بکات و ئەرکی زۆرتری پێ بسپێرێ ، دەیزانی کە تەنیا کەسێکی ئازاو بەتوانای وەك ئەو جێبەجێی دەکات [2] ، نورەدین لەوە گەیشتبوو ، کە شێرکۆ مەبەستی یەك پارچەیی خاکی ئیسلامە، پێشەوایە، چاونەترسەو بەجەرگە [3] ، هەر لەبەرئەوە بۆ دەستنیشان کردنی وەك فەرماندەی گشتی لەمیسردا لەگەڵ تەمەنی زۆردا بیابانی بڕی [4] .

داستانەکانی لە میسر بەسەرسوڕمانەوە باس دەکرێت ، لەوانە کاتی گەمارۆی شاری ( بلبیس ) ی میسر ، دوای ئەوەی سوپای میسرو خاچیەکان ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی بێ شەڕ بکشێنەوە ، شێرکۆ بە ( تەوریکەوە ) ڕاوەستابوو بەڕێی دەکردن و پشتی سوپاکەی دەپاراست ، ئەم کردەوەیە سەرنجی یەکێك لە سەربازە لاوەکانی خاچیەکانی ڕاکێشا کە لێی نزیك بێتەوە پێی بڵێت : " ناترسی لەمانەی دەوریان داویت، میسریەکان یان خاچیەکان فرسەتت لێبهێنن بەتایبەت کە چواردەورت چۆڵ بووە " . شێرکۆ لە وەڵامدا وتی : خۆزگە ئەونیازەیان جێبەجێ دەکرد تا بزانی چی دەکەم ، سوێند بێبە یەزدان تا ژمارەیەکی زۆر نەکوژین یەکێ لە ئێمە نابێ بکوژرێت . سەربازە خاچیەکە لەبەر دەمیدا زەردهەڵگەڕابوو ووتی :" وامان دەزانی خاچیەکان زیادڕۆیی دەکەن لەباسی شێرکۆداو ترساون ، بەڵام ئێستا دەڵێم هەرچی دەڵێن و وتویانە ڕاستە و دروستە " [5] .

هەروەها سەرنجی شەڕی ( بابین ) بدە ، کە لەساڵی ( ٥٦٢ ك ـ ١١٦٦ ز ) دا لە میسر ڕووی داوە ( ئیبن ا پیر ) دەڵێ : " جێی سەرنج و تێڕامانە ، کە مێژوو ئەوە تۆمار بکات ژمارەیەکی کەم سەربازی شام بتوانن هەردوو سوپای میسر و خاچیەکانی کەناری دەریا ببەزێنن " [6] . هەروەها کارێکی کەم وێنەیە کاتێ شێرکۆ بتوانێ بەناو گەمارۆی یەك مانگەی دوژمندا لەشاری ئەسکەندەریە دەرباز ببێت و لەنیوەی شەودا بەرەو شاری ( قەوس ) [7] بکەوێتە ڕێ [8] .

---

(١) حسين مؤنس : صور من البطولة ، ل٢٥٧ .
(٢) الروضتين ، ج١ /ل ١٣٠ .
(٣) النجوم الزاهرة ، ج٦ / ل ٥ ؛ حسين مؤنس : نور الدين محمود ، ل٣١٧ .
(٤) الخطط ، ج٢ / ل١٥ ؛ سعيد عبد الفتاح عاشور : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل٦٨٣ . بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە ل ٩١- ٩٦
(٥) تاريخ الباهر ، ل١٢٢ ؛ الروضتين ، ج١ /ل ١٣٢ ؛ شفاء القلوب ، ل٢٨ .
(٦) الكامل ، ج٧ / ل١٨٩ .
(٧) قەوس : شارێکی گەورەیە سەربە ( سەعید) ی میسرة ( معجم البلدان ، ج٤ / ل٤١٣ ) .
(٨) شفاء القلوب ، ل٣٠ ؛ رانسيمان : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل ٦٠٦ .

مێژوونوسی فەرەنسی ( میشۆد ) زیادە ڕۆیی نـەکردووە کـە دەڵێـت: " شـێرکۆ شارەزایی تەواوی هەبووە لەشەڕدا " [1]. بۆیە بەگەڕانەوەی لە هێرشی دووەمدا نورەدیـن شوێنێکی پڕ مەترسی تری پێ سپارد ، ئەوەش پاراستنی شاری ( حمـص ) بـوو لـەنێوان موسوڵمان و خاچیەکاندا [2] .

ناوبانگی شێرکۆ لەسەر زاری هەموو موسوڵمانێك وەك ڕزگار کـەر و پاڵـەوان باس دەکرا هەر لەبەر ئەوە ساڵی ( ٥٦٤ ك / ١١٦٨ ز ) دانیشـتوانی قـاهرە گـەورەترین پێشوازیان لێ کرد [3] ، کەواتە هەموو ئەو ڕاستیانە لـەو ئەنجامـەوە هـاتوون ، هـەر کارێکی پێ سـپێردرابێت سـەرکەوتوو بـووە . بـەڵام ناوبـانگی لـە مێـژوودا بـەهۆی ناوبانگی نورەدین مەوە دا پۆشراوە [4].

باسی ئازایەتی و ئەبەردی شـێرکۆ چـەندی لەسـەر بوترێـت تـەواو نـابێت کەواتە با لایەنەکانی تری جوامێری بـاس بکـەین و لـەیادیان نەکـەین ، لەوانـەیش ڕێزگرتن و خۆشەویستی دەوروبـەری دەری دەخـات شـێرکۆ بـۆ خـۆی نـەژیاوە لـە ڕوی خۆشەویستیەوە لەناو سەرلەشکرو سەربازەکانیدا کەم وێنە بوومو بـەویژدان و خـاوەن بەزەیی و سۆز بووە ، خەم خۆری دەورو بەرەکەی بووە ، هەوڵی داوە پێداویسـتیەکانیان بۆ مسۆگەر بکات [5]. ئەم دڵسۆزی و خەم خۆریە کاریگەربوو،هەرکاتێ فەرمانی بکردایە لەشەڕو ئاشتیدا فەرمانەکانی جێ بەجێ دەکرا [6] .

خاڵێکی تری جوامێری ئەم کەسایەتی‌یە، کە لەئاکاریدا بەدی دەکرا دەست و دڵفراوانی و چاوتێری بووە، ئەمانە سەرمایەیەك بوون زیاتر مەزنی و خۆشەویسـتیان بۆ پەیداکردبوو .(ولیم صوری ) زۆرجوان بـاسی دەکات و دەڵێـت: " ئـەو سـامانەی کـە شێرکۆ دەیبەخشی زۆرتربوو لەوەی کـەخۆی هـەیبوو چونکـە دەیویسـت کـە بەنـەمری بمێنێتەوە" [7]، ( ئیبن فورات )یش دەڵێت: " شێرکۆ بەخێرخوازوچاکەکەر ناسرابوو" [8].

لەبەر ڕۆشنایی ئەم زانیاریانەدا دەگەینە ئەو قەناعەتەی کـە شـێرکۆ لـە تەمەنی لاوێتییەوە ، تا دواساتەکانی ژیانی لە پێناوی ڕزگاری و یەکخستنی ئیسـلامدا جەنگاومو بەرەنگاری خاچیەکان بۆتەوە ، سەرەتا لە وڵاتی شام و دواتر لـە وڵاتـی میسر ، زۆر لەم ڕوبەڕو بونەوانە دەستەو یەخەبومو خۆیشی ڕۆڵی مەزنی تێدا بووە .

---

(١) لە احمد بیلی : صلاح الدین ، ل٨٨ وەرگیراوە .
(٢) البنداري : سنا البرق الشامي ، ل٧٠ .
(٣) النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣٥٠ ـ ٣٥١ ؛ سعید عاشور : الحروب الصلیبیة ، ج٢ / ل٧٠٠ .
(٤) رانسیمان : الحروب الصلیبیة ، ج٢ / ل٦١٩ .
(٥) حسین مؤنس : صور من البطولة ، ل٢٥٣ .
(٦) رانسیمان : الحروب الصلیبیة ، ج٢ / ل٦١٩ .
(٧) لە السید الباز العریني : الحروب الصلیبیة ، ج٢ / ل ٦١٧ وەرگیراوە .
(٨) تاریخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل٥٠ .

مێژوونووسان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن و دەڵێن : " ئەو سوود و سەرمایەی شێرکۆ بۆ ئیسلامی بەدەست هێنا پێویستە مێژوو بە ئاوی زێڕ لەلاپەڕەکانی خۆیدا بینوسێتەوە ، لەبەر ئەوەی بەزەبری جەنگاوەری ئەو دوای ( بیست ) ساڵ قودس و شارەکانی تری سوریا و فەلەستین ڕزگار بوون و دوای ئەوەی زیاتر لە سەدەیەك لەژێر دەستی ئەوروپایەکاندا بوون "[1].

سەبارەت بە ئازایەتی و جوامێری گەلێ لەشاعیران هۆنراوەیان پێدا وتووە لەوانە ئبن الزوبیر[2] حسان بن نمر[3] هەروەها ( عمادەدین کاتب )یش لەم بوارەدا بەشداره[4]

---

(١) له احمد بيلي: صلاح الدين ، ل٩٧ ؛ جرجي زيدان : صلاح الدين ، ل٧ وەرگیراوە .

(٢) ابن الزبیر دەڵێت :

لیهنك حين استجمع النصرو الفخر المجيد فلم يسمح بمثلها الدهر .

( پیرۆزبێت لێت کاتێك کۆدەبنەوە سەرکەوتن و شانازی و شکۆداریت

که هەرگیز زەمانە وەك تۆ ڕێگەی نەداوە بەکەس ) ( شفاء القلوب ، ل٢٨ )

(٣) هەروەها حسان بن نمير دەڵێت :

بجأشك لا بجيشك نلت هذا و بالتوفيق لا بالاتفاق

( بەدڵی ئازات نەك بە سوپات گەیشتی بەمە بە یارمەتی خوا نەك بە ڕێکەوت )

( ديوان عرقله الكلبى ، ل٦٨ )

(٤) عیمادەدین دەڵێت :

وبلاد الاسلام انقذتها انت في الشرك ايما انقاذ .

( تۆ وڵاتی موسوڵمانانت ڕزگار کردووە له بێباوەڕان چۆن ڕزگار کردنێك )

( الروضتين ، ج١ / ل ١٤٥ )

هەروەها لە دێڕێکی تردا ستایشی ئاکاری دەکات و دەڵێت :

لو في زمان رسول الله كنت اتت في هذه السيرة المحمودة السور

ئەگەر لە ڕۆژگاری پێغەمبەر بویتایە

بەم ڕەوشتە بەرزانەت کە هەمیشە سوپاس ئەکرێیت .

( الروضتين ، ج١ / ل١٤٥ ؛ عبد الطيف حمزة : ادب الحروب الصليبية ، ل٩١ )

هەروەها دەربارەی سەرکەوتنی شێرکۆ لە میسردا دەڵێت :

بلغت بالمجد ما لا يبلغ البشر و نلت ما عجزت عنه نيله القدر

افخر فان ملوك الارض اذهلهم ما قد فعلت فكل فيك مفتكر

بەکۆششی زۆرت گەیشتوی بە پلەیەك کە مرۆڤ پێی ناگات

پلەیەکت بەدەست هێناوە کە قەدەر ناتوانێت بەدەستی بێنێت

شانازی بکە چونکە پاشاکانی سەرزەمینت سەرسام کردووە

ئەوەی کە تۆ کردووتە هەموویان بیر لە تۆ ئەکەنەوە

( الروضتين ، ج١ / ل١٤٥ ؛ عبد الطيف حمزة : أدب الحروب الصليبية ، ل٩١ )

دووەم

## وەفـــــاداریی

شێرکۆ لە مەیانی وەفاداری و ڕەوشت بەرزیدا دانسقە بوو لەبەرئـــەوەی وەفـــادار بووە بەرامبەر بەو کەسانەی کە لەگەڵیدا هاوکاربوون لەسەرو خـۆی بووبـن یـان نزمـتر ، لێرەدا پێویستە ئەو خاڵە دەست نیشان بکەین ، کە شێرکۆی خستبووە دڵی ( نورەدیـــن )ە وە و ببوە مایەی نزیك بونەوە لێی ، بێجگە لە ئازایەتی‌یەکەی وەفاداری بوو، [1] بەرامبەر بە عیمادەدین زەنگی باوکی ، وەك پاڵەوانێك خۆی کردبووە ڕەمـــزی سـەربازێکی نەناسـراوو نموونەی جەنگاوەرێکی موجاهید ، لەگەڵ ئەوەشدا بــەژیری و کارامــەیی خـۆی بەهــەموو شێوەیەك پشتگیری لە حوکمڕانی عیمادەدین دەکرد [2] کاتێ کە عیمادەدین زەنگـــی کـوژرا شێرکۆ لەگەڵیدا بوو ، لە ئەنجامی وەفاداری و دڵسۆزی بۆ ئەم بنەماڵەیە لە پلەو پایـەی دەوڵەتیدا لای عیمادەدین زۆر پێشکەوت [3]، بەشێوەیەك چووە ئـاستی ( نورەدین ) ی کوڕی [4] و تەنـانەت لای قـــەڵای ( جعـبر ) [5] یـش شـێرکۆی لەگــەڵدابووە [6]. دوای بـاوکی لەگــەڵ نورەدینـدا وەك وەفـادارێك هەر مایەوە و لێی نــەبڕا و تەنـانــەت لــەزۆر شەڕیشـدا هــەر بەیەکەوە بوون [7]وە لە ناسکترین ڕۆژانی ژیـــانیدا جێـی نەهێشـت و جوانـترین وەفـاداری لەگەڵ دا کرد بۆ نمونە : کە عیمادەدین سـالّی ( ٥٤١ ك / ١١٤٦ ز ) کـوژرا. وەزیــری موسـل داوای لە شێرکۆ کرد لەگەڵی بچێت بۆ موسل لەگەڵ ( سیف الدیــن ) دا بـن وە هــەموو کـارو بارێك بدرێتە دەست شێرکۆ ، بەڵام ئەم وەفادارە وتی : من لەگەڵ نورەدین دا دەبم و جێـی ناهێڵم . وە بە ئـاماژەی شێرکۆ و پاشان بـــە هــەموو جۆرێـك لە پاراسـتن و جێگـیر بوونـــی دەسەڵاتی‌دا پشتگیری کرد ، هەر بۆیە نورەدیـن دوای جێگـیر بوونـــی ، شـێرکۆی بـۆ خـۆی هێشتەوە [8].

---

(١) الروضتين ، ج١/ ل١٣٠؛ تاريخ ابن الفرات، مجلد ٤ / ج١ /ل٥٣ ؛ عمر موسى : ادب الدول المتتابعة ، عصر الزنكيين و الايوبيون و المماليك ، ل٣٦ .

(٢) النجوم الزاهرة ، ج٦ / ل٤ ـ ٥ ، شەرەفنامە ، ل١٢٨ .

(٣) تتمة المختصر في اخبار البشر ، ج٢ / ل١١٧ ؛ محمد امين زكي : مێژووی کورد و کوردستان ، ج١ / ل٢٦٥ .

(٤) وفيات الاعيان ، ج١ / ل١٤٢ ؛ عبد العزيز سيد الاهل : صلاح الدين ، ل٣٧ .

(٥) جەعبەر : قەڵایەکە لەسەر ڕووباری فورات لەنێوان بالس و ڕەقەدایە. ( معجم البلدان ، ج٢ / ل١٤٢ ) .

(٦) تاريخ ابن الفرات، مجلد ٤ / ج١ / ل٥٢ ؛ اتعاظ الحنفا ، ج٣ / ل١٨١ ؛ سعيد عاشور : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل٦١٠ .

(٧) الروضتين ، ج١ / ل٤٦ ـ ٤٧ ؛ وفيات الاعيان ، ج١ / ل١٤٢ ؛ المواعظ و الاعتبار ، ج٢/ ل٢٣٢ .

(٨) تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل٥٣ .

سەبارەت بە وەفاداری شێرکۆ بەرامبەر بەبنەماڵەی زەنگی چەند دێڕێك هۆنراوەی خودی نورەدین دەنوسین کە بۆ شێرکۆی وتووە پاش چاکبوونەوەی لەنەخۆشی ساڵی (٥٥٢ ك / ١١٥٧ ز ) کە چۆن سوپاسی دەکات :

لقد حسنت صفاتك يا زماني     و فزت بما رجوت من الاماني
فولى الخوف مهدوم الحسباني     و عاد الامن معمور المغاني[١]

خاڵێکی تر لە وەفاداری لەگەڵ برادەرەکانیدا بووە ، لەوانە ( جمال الدين ئەصفهانی ) بوو کە دوای پێوەندی بەبنەماڵەی زەنگییەوە ناسیاوی لەگەڵ پەیدا کردو میانەی لەگەڵیا زۆرخۆش بوو ، تا گەیشتە ئەوەی بەڵێن بەیەك بدەن وەك وەفایەك بۆ ئەم پەیوەندییە یان هەرکەسیان زوو مرد ئەوی تر سەرپەرشتی خەرجیەکەی بکات[٢]" ئەوە بوو جمال الدين زووتر کۆچی دوایی کرد ( ٥٥٩ ك / ١١٦٣ ز) دا[٣]، پێش مردنی ( ابو قاسم ) ی راسپارد بۆ پارەی گواستنەوەی تەرمەکەی لە موسڵەوە بۆ شاری ( مەدینە ) ی پیرۆز بە هەموو خەرجییەکەوە بچێت بۆ لای ( شێرکۆ )[٤] .

ئەبو قاسم هاتە لای شێرکۆ، لەوەڵامدا ئەم وەفادارە پارەیەکی زۆرباشی پێدا ، تا کارەکە ئەنجام بدرێ سەرباری ئەوەش پارەی تری دایە بۆی بکات بەخێرو چاکە ، ئەمە رەوشتی جوانی وەفاداری ئەم زاتە بووە، کە بەڵێنی زیاد لە ( ٢٠ ) ساڵ لەومو پێشی وەك وەفایەك بەجێ هێنا[٥] . لەهەمان کاتدا شێرکۆ وەفای زۆر بووە بەرامبەر بەهەموو کەسێك کە هاوکارییەکی خاوێنی لەگەڵدا کردبێت ، بۆ نمونە لە دوای هێرشی دووەم بۆ سەر میسر دانیشتوانی ئەسکەندەرییە هاوکاری لەشکرەکەیان کرد، دوای رێککەوتن یەکێك لەو خاڵانەی کە شێرکۆ لە خاچیەکان و سوپای میسری داواکردبوو ئەوەبوو کەنابێت دەستکاری دانیشتوانی ئەسکەندەریە بکەن بەگشتی و بەتایبەتیش ئەوانەی کە هاوکاری سوپاکەیان کردووە[٦] .

ئەم جوامێرە لە ژیانیدا بەم رەوشت و نمونە بەرزانە ناسراو ، بۆیە بووە پێشەواو چرای بەشەوقی سەردەمی خۆی، بەم دێرە هۆنراوەیەی عیمادەدین کۆتایی بە باسەکەمان دەهێنین کە بۆ شێرکۆی وتووە :

يا كريما عن كل شر بطيئا     والى الخير دائم الاغداد[٧]

---

(١) ذيل تاريخ دمشق ، ل٣٥٠
( هاورێم بەڕاستی ڕەوشتەکانت جوان بوون     بەو هیوایەش گەیشتم کە ئاواتە خوازی بووم
ترس پشتی هەڵکردو هەڵهات     ئنجا ئارامی و دڵنیایی گەڕایەوە )
(٢) الروضتين ، ج١ / ل٢١١ ؛ تتمة المختصر في اخبار البشر ، ج٢ / ل١٠٥
(٣) الكامل ، ج٧ / ل١٧٨ .
(٤) تاريخ الباهر، ل١٢٧ ـ ١٢٨ ؛ تتمة المختصر في اخبار البشر، ج٢ / ل١٠٥.
(٥) مراة الزمان ، ج٨ / ق١ / ل٢٤٨ ؛ البداية والنهاية ، ج١٢ / ل٢٤٨ ـ ٢٤٩ مختصر في اخبارالبشر،ج٣/ ل٤١ ـ ٤٢ .
(٦) رانسيمان : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل٦٠٦ .
(٧) الروضتين ، ج١ / ل١٥١ ،
( ئەی بەخشندەو دوور لە هەموو خراپەیەك     ئەی ئەو کەسەی کە هەمیشە بۆ خێروچاکە خێرایت )

### سێیەم

## ســــوارچـــاكـــی

سوارچاكی لەرووی مێژوویی‌یەوە سەر بەسیستەمی ڕژێمی دەرەبەگایەتی‌یەو بۆ ئـــەو ڕۆژگارە دەگەڕێتەوە بەتایبەتی لەباشوری فەرەنسادا [1] . لە ڕۆژهەلاتیشدا بە تایبـــەتی لـە ڕیزەكانی سوپای ئیسلام دا، سوارچاكی وەك ناسناوێك بەبالای ئەو جەنگاوەرانەدا بـڕاوە كـە بە سواری‌یەوە ڕمیان بۆ سەرسنگی دوژمن دەهاویشت، كوردیش لەم نەریتـــە بێبـەش نـەبووەو ناوبـانگی خۆی هەبووە[2]. دیارە ئاما نجی موسوڵمانە جەنگاوەرەكان لەنەریتی سوارچاكی بـــۆ شكۆمەندی ئایین دەگەڕێتەوەو بەشێك بووە لە بەرنامەی مەشق كردن بۆ یـاری ( صەولـــەجان ) [3] كە لەو سەردەمەدا بایەخی پێ دەدراو تابووە یەكێك لە خەســڵەتەكانی سـوارچاكی ، بـە تایبەت لەو ناوچانـەدا ، كـە لەسـنووری شـەڕو دوژمنكاری‌یـەوە نزیـك بـوون. بەتایبـەتی لەسەردەمی شێركۆداو لە وڵاتی شام دا كە خاچیەكان دوژمنی سەرسەختیان بوون پێویستی بـە سوارچاكی دەكرد، كە پشت بەهێزێكی بە توانا ببەستن لەبەر ئەوە ئەم یاری‌یە پەرەی سـەندو بووە نـــەریتێكی مەشـقی سـەربازی و بـووە كـارێكی ئـەو تـۆ، كـە دەبوایـە سـەرجەم مـیرو سەرلەشكرەكان شارەزایی‌یان تێدا هەبێت [4]. لەم هونەرەدا شێركۆ خۆی پسپۆر بووە [5]

( ولیم صوری ) كە دێتـە سـەر باسـكردنی ئـەم پیـاوە دەڵێـت :" پێشـەوای سـوار چاكەكانی ( نورەدین ) ە و لە هەمووان چا پووكترە" [6]. ئـەم یاری‌یـە لـە شـام بەگشـتی‌و لــە دیمەشقدا بەتایبـــەتی لەلایـەن نورەدیـن و شـێركۆوە وەك پێشـەوای لەشكرو مـیران لـــە گۆڕەپانی ( سەوز ) گرنگی‌یەكی باشی پـێ‌دەدرا[7] و ئـەوەبوو، كـە سـەربازو سەرلەشكرەكانیان مەشق پێ دەكردو هەوڵیان دەدا، كە هونەری سوارچاكی و كشانەوەی خێرا فێربین [8].

---

(١) عبد المنعم الغلامي: مآثرالعرب الاسلامي في القرون الوسطى، ل٢٥، پ٤.

(٢) احمد بيلي : صلاح الدين ، ل٥٢ .

(٣) الصولجان : لەسەردەمی خەلافەتی عەباسی‌یەكاندا سوارچاكی شێوەیەكی نوێی وەرگرت، ئەویش یاری تۆپ و گۆچانە (صەولەجان)، یاری جەوگان لەیاری‌یە وەرزشیەكانی ڕۆژهەلاتە، یاریزانەكان بەسواری‌ئەسپەوە بەگۆچانێكی تۆزێك چەماوەوە لەتۆپێكی تەختە دەدەن. (صبح الاعشى، ج٤ / ل٤٧ ؛ ج ٥ / ل٤٥٨ ؛ هاملتۆن : صلاح الدين، ل١١٨) ؛ هارونە ڕەشیدو وەزیرەكانی حەزیان لەم یاری‌یە بووەو بایەخیان پێداوەو دواتر ڕۆژئاواییەكان لە موسوڵمانەكانەوە فێربوون و كردیانە موڵكی خۆیان.(عبدالمنعم الغلامي: ماثر العرب في القرون الوسطى، ل١٩٦ ).

(٤) تاريخ الباهر، ل١٦٨ ـ ١٦٩؛ البداية والنهاية ، ج١٢ / ل٢٣٢ ؛ عبدالطيف حمزة : ادب الحروب الصليبية ، ل٢٣٩

(٥) عمر ابونصر: صلاح الدين ، ل١١ .

(٦) لە السيدالبازالعريني: الشرق الاوسط والحروب الصليبية، ج١ / ل٦٦٧ وەرگیراوە،هەروەها ئەم دێڕە هۆنراوەیەش دەبێتە بەڵگەی ئەم ڕاستی‌یانە : ما زلت سباقا الى الطريق العلى تجري بغير توقف و تخلف ( تائێستاكەش هەر تۆ پێشەنگی ڕێی سەركەوتنی هەر ئەڕۆی بەبێ دواكەوتن و وچان دان )( تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل٥٤ — ٥٥ )

(٧) مفرج الكروب ، ج١ / ل١٠ .

(٨) البداية والنهاية ، ج ١٢ / ل ٢٣٧ ؛ شاكر احمد ابو البدر : الحروب الصليبية ، ل١٩١ .

هەروەها بۆ ئەوەی بتوانن ،کە ڕاستەوخۆ لە نیشان بدەن و ئەسپەکانیش مەشق پێ بکەن و گوێ ڕایەڵی سوارەکان بن [1] . بەم جۆرە مەشق ببێتە هۆیەکی سەرەکی بزاوتن و وریا کردنەوەیان و ئەم مەشقەیش وا دەکات زیاتر پشتیان لە شەڕدا پێ ببەسترێت . جگە لە جەنگاوەران هەندێ جاریش پیاوی ئایینی و زانست خوازیش بەشداریان لە مەشقی سوارچاکیدا دەکرد تەنانەت خودی ( پاشا ) یش [2] .یاری سوارچاکی بەجۆری برەوی پەیدا کرد ،کە بووە دیاردە و خویەکی خوا پەرستی ، جگە لەکات بەسەر بردن و پتەو بوونی لەش و بەرزکردنەوەی وورە و خۆسازدان لە پێناوی هێرش و سەرخستنی پەیامی ئایین دا .

بابەتەکانی ئەدەبی ڕۆژئاوا لە زۆربەی بەرهەمەکانیاندا بەتایبەتی چیرۆك و نوسراوی ئەو سەردەمەدا ئاماژە بە تواناو لێهاتوویی جەنگاوەرانی موسوڵمان دەکەن بە تایبەتی لەشەڕی خاچیەکاندا [3] . دیارە ئەم ئاماژەیەش لە خۆوە نییە نورەدین و سەرکردەکانی لەشکرەکەی بەتایبەتی شێرکۆ، کە هەمیشە یاوەری بوو ، ڕۆژانە و دوای نوێژی عەسران سەرقاڵی ئەم یارییە بوون تەنانەت گەیشتووەتە ڕادەیەك پیاوە ئایینییەکان ڕەخنەیان لەم کارەی نورەدین گرتووە ، ئەویش بە ناچاری و بە قەڵەمی خۆی وەڵامی داونەتەوە . دەری خستووە کە ئەم یارییەو ئەنجامەکانی بۆ کات بەسەر بردن نییە ، بەڵکو خۆسازدانە بۆ بەرەنگار بوونەوەی دوژمنان و مەشقی ئەسپەکانەو تا پەلیان ( جمام ) نەبێت و گوێ ڕایەڵی خاوەنەکانیان بن [4] .

نورەدین وەك باسدەکرێت، بەجۆرێك خولیاو سەودا سەری ئەم یارییە بووە ، کە لەکاتی خۆرئاوا بوون لەبەر ڕۆشنایی ئاگردا ئەنجامیداوە [5]. و بنەماڵەی شێرکۆ ( براو برازاکانی ) بەشداری ئەم یارییەیان کردووەو تێیدا پسپۆر بوون [6]. سوارچاکی شێرکۆ بە شێوەیەك بووە ،کە بتوانێ سێ جار بیابان ببڕێ ، گەرچی هەرجارەی گەردەلول ڕوبەڕووی دەبووەوە [7] لێرەیشدا ئاماژە بەدێرە هۆنراوەیەکی ( عماره الیمنی ) دەدەین کە دەڵێت : [8]

یان ( عەرقەلەی کەلبی ) دەڵێت :

وما نخشى على الاسلام بؤسا   اذا هلك الجميع و انت باقي [9]

---

(1) تاريخ الباهر، ل١٦٨ ـ ١٦٩، ١٨٦ ـ ١٨٧؛ عبدالطيف حمزة : ادب الحروب الصليبية ، ل٢٣٨.
(2) سعيد الديوجي : تاريخ الموصل ، ج١ / ل٤٣٥ .
(3) ادب الحروب الصليبية ، ل٢٣٨ .
(4) تاريخ الباهر ، ل١٦٨ ـ ١٦٩ .
(5) سنا البرق الشامي ، ل٧٠ ؛ الغزي الحلبي : نهر الذهب في تاريخ حلب ، ج٢ / ل٩٦ ؛ عمادالدين خليل : نورالدين محمود ، ل٤٣
(6) عبد العزيز سيد الاهل : صلاح الدين ، ل٣٤ .
(7) النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣٥٢ ؛ حسين مؤنس : نور الدين محمود ، ل٣١٧ .
(8) بروانە ( بە شی دووەم ــ یەکەم هەڵمەتی سەربازی / ل٩٤ ، پ٤ ) .
(9) ديوان عرقلة الكلبي ، ل٦٨ ـ ٦٩.

( ئێمە لە فەوتاندنی ئیسلام ناترسین   کە سەرجەم بە هیلاك بچن تەنها تۆ بمێنیت )

## چوارەم

### داد پــــەروەریی

شێرکۆ لەنێو موسوڵمانانندا نـاسـراو بـوو بەئازایـەتی و دەسـت و دڵفراوانـی و بـە دادپەروەری و دژایەتی کردنی زوڵم و زۆر ، بێ پشوودان کۆششـی دەکـرد بـۆ پراکتـیزەکردنی یاساو بەجێهێنانی یەکسانی لەو شوێنـانەدا کە تیایدا بالآدەست بووە، ( ئیـبن ئـثیر ) دەڵێـت : نورەدین محمود یەکەم کەس بووە کـە خانـەی دادپـەروەری لـە دیمەشـق دامـەزراندووەو [1] ، هەفتەی دوو رۆژیش دادەنیشت ، رۆژێك بە ( کمـال الدیـن ) ی دادوەری دادوەرانـی وت کـەس نابینم شکات لەشێرکۆ بکات و کڕنووشی برد بۆ یەزدان و سوپاسی کرد[2]. شێرکۆ بەرامبەر بـە تاوانباران و سەرکێشی کەران لە دادپەروەریدا زۆر توندوتیژ بوو، بۆ نموونـە لەسـاڵی ( ٥٥١ ك/ ١١٥٦ ز) دا لەژێر چاودێری شێرکۆدا کەجێگری سوڵتان بـوو ( ئـەبا سـالم کـوڕی همـام ی حلبی ) چاودێریکەری دیوانی دیمەشق بوو تۆمەتی خیانـەتی خرایـە پاڵ ، دوای لێکۆڵینـەوە لەکێشەکە بڕیاری دا، کە بیگرن و بە پێی یاسا سزای بدەن [3]. لێرەدا ئەم دێـڕە هۆنراوەیـەی ( عماد الدین کاتب ) هاوتەمەنی دەخەینە بەرچاو کەباسی دەکات چ دادپـەروەرێك بـووە لـەو سەردەمەدا .

أصبحت بالعدل و الاقدام منفردا فقل لنا اعلي انت ام عمر [4]

ئەم زاتە هەروا بەخۆڕایی ئەم ناوبانگەی ئەجیـهانی ئیسلامیدا بڵاونەبووەتـەوە هەرچی ئاکاری جوانە لەم زاتەدا هەبووە تەنانەت بە ڕەوشت جوانـی خـۆی هـەموو کەسێکی منەتبار کردووە. هەمیشە وەك لایەنێکی دادپەروەر خۆی بێبەش دەکرد لە دەست کەوتـەکانی شەڕو قازانجی خۆی بەلاوە دەنا بۆ سەرلەشکرو سەربازەکانی [5].

سەرباری ئەمانەی کە لێیان دواین ، ئەگەر بڕوانینە ڕەفتاری لەگەڵ کـەس و کـاری خۆیدا دەڵێین : ئەوەندەی تر لا پەڕەکانی ژیانی گەشترو جوانتر بووە لەم بوارەدا کـە دوژمـن و ناحەزانی خۆشی سەرسام کردبوو، ئەویش بەسنووردانان بۆ دەسەلآتیان ، تـاوەکو زیـادڕۆیی نەکەن و نەبنە مایەی نارەحەتی و سەرچاوەی زوڵم و ستەم بۆ سەر کەسـانی دی [6]. سـەرجەم ئەم ڕەفتارانە بوونەتە ناسنامەی شێرکۆ کە وەك موجـاهیدێك لـە پێناوی ئـایینی ئیسـلام دا ناسـاندویانە و هیـچ سـەرچاوەیەکی مێژوویـیش لەهـەموو لا پـەڕەکانی ژیـانیدا باسـی ڕەشەکوژییەکی تیا نییە، کە بەفەرمانی ئەم ئەنجامی درابێ. ( ئیبن زبیر ) لە هۆنراوەیـەکیدا سەبارەت بە شێرکۆ هەڵی داوەو دەڵێت :

و هل يلبث الاضلام و الظلم ساعة اذا مابدا من وجهك الشمس و البدر [7]

---

(١) تاريخ الباهر ، ل١٦٨ .

(٢) الروضتين، ج١ / ل٨؛ البداية والنهاية ، ج١٢ / ل٢٨٠ ؛ عبدالطيف حمزة : أدب الحروب الصليبية، ل٥٢؛ محمود السرطاوي : نورالدين في الادب العربي، ل٧١ .

(٣) ذيل تاريخ دمشق ، ل٣٦٦ .

(٤) لە الروضتين، ج١ / ل١٤٥وەرگیراوە .( لە دادپەروەری و ئازایەتیدا کەسێکی بێ هاوتایت دەپێمان بڵێ تۆ (علی)ت یان (عمر)ی

(٥) حسين مؤنس : نور الدين محمود ، ل٣١٧ .

(٦) الروضتين ، ج١ / ل١٧٢ ؛ تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل٥١ .

(٧) لە شفاء القلوب ، ل٢٨ وەرگیراوە

( ئایا تاریکایی و ستەم کاری ساتێك دەمێنێتەوە کاتێك مانگ و ڕۆژ لە ڕوخسارت دەردەکەوێت )

## پێنجەم

## دبلۆماسیەتی

دبلۆماسیەت وشەیەکی یۆنانییە لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی رۆمانیەکاندا بە واتای پارێزگاری کردن لە بڕوانامەو پەیماننامەکاندا بەکارهێنراوە. لە ڕووی زاراوەوە دبلۆماسیەت بریتییە لەئاگاداریەکی فرە لەبوارەکانی ڕەفتارنواندن ووریاییداو مامەڵەی ژیرانە لەگەڵ دەوروبەرو خۆ قوتارکردن لە تەنگانەو خلیسکاندن دا [1].

لە ڕاستیدا بنەماڵەی شێرکۆ دەمێك بوو تێکەڵاو بەسیاسەت بووبوون و شارەزایی زۆریان لەم بوارەدا هەبوو [2]، هەر لەسەرەتاوە شێرکۆ لەم بوارەدا وریا بووەو هەردەم وەك سەرکردەیەکی سەربازی و لەهەمان کاتدا وەك باڵوێزێکی حکومەتی حەلەب کارەکانی ئەنجامداوە، لەبەرئەوە نورەدین محمودیش لەحەلەب بڕوای خۆی بەشێرکۆ بەخشی بوو، بە مەرجێك وەك ڕاوێژکارو سەرکردە لە حکومەتەکەی دا ڕۆڵ ببینێت [3]. ئەم حاڵەتەش بووە پراکتیك، ئەوە بوو لەساڵی (٥٤٤ ك / ١١٤٩ ز) دا (سەیف الدین غازی) برای نور الدین، کە فەرمانڕەوای موسڵ بوو کۆچی دوایی کردوو (قطب الدین) [4] خرایە شوێنی، بەڵام میرەکانی ئەو ناوچەیە بە نورەدین یان ڕاگەیاند، کە فەرمانداریێتی ناوچەکە بگرێتە دەست، لەبەرئەوەی ئەم لە (قوتبەدین) گەورەترە [5]، پاشان خۆی و گەورە پیاوانی ناوچەکەو شێرکۆ [6] هاتنە شەنگار [7] و دوای رێکەوتن شەنگار کەوتە ژێر دەستیان [8]، بەڵام فەرمانڕەوای موسڵ ئەم کارەی پێ باش نەبوو، هەربۆیە بەسوپاوە هاتە تەلەعفەر [9] خەریك بوو خوێن بڕژێت بەڵام بە ئاشتی چارەسەر کرا [10].

شێرکۆ بۆ چارەسەرکردنی هەموو کێشەکان دەوری لەبەرچاوی هەبوو، هەروەها نوێنەری حکومەتی حەلەب بووەو پەیوەندی دۆستانەیشی لەگەڵ (جمال الدین) وەزیر هەبووە [11]، لەئەنجامدا کێشەکەیان بەئاشتی چارەسەرکردو بڕیاریاندا لەجیاتی شەنگار، (حمص) و (ڕەحبە) بدەنە نورەدین لە شام [12].

---

(١) احمد عطية : القاموس السياسي ، ل٥١٨ ـ ٥١٩ .

(٢) كارل بروكلمان : تاريخ الشعوب الاسلامية ، ل٣٥٠ .

(٣) الروضتين ، ج١ / ل١٣٠ ؛ العبر في خبر من غبر، ج٤ / ل١٨٠؛ محسن محمدحسين : صلاح الدين، ل١٥؛ السيدالباز العريني : الشرق الادنى و الايوبيون ، ل٢٦ .

(٤) قوتبەدین مەودود : کوڕی عیمادەدین زەنگییە ، چاکترین فەرمانڕەوای موسڵ بووە ژیاننامەیەکی خاوێنی هەبووە ، خێرخوازو بەئارام بووە لە ساڵی(٥٦٥ ك/ ١١٦٩ز) کۆچیدوایی‌کردووە. (زبدة الحلب ، ج٢/ ل٣٠١ ؛ وفيات الاعيان، ج٥/ ل٣٠٢)

(٥) تاريخ الباهر، ل٩٥ ؛ زبدة الحلب، ج٢ / ل٢٩٦ ؛ الروضتين ، ج١ / ل ١٧٢؛ رشيد الجميلي: دولة الاتابكة في الموصل ، ل٨١ .

(٦) مفرج الكروب ، ج١ / ل ١١٨ .

(٧) شەنگار(سنجار): شارێکە لە جەزیرە لای موسڵ نزیك شاخی سنجارە (معجم البلدان، ج٣/ ل٢٦٢).

(٨) تاريخ الباهر، ل٩٥ ـ ٩٦؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل٢٩٧ ؛ البداية و النهاية ، ج١٢ / ل ٢٦٦ .

(٩) زبدة الحلب ، ج٢ / ل٢٩٧ .

(١٠) الكامل ، ج٧ / ل ٧٥ .

(١١) الروضتين، ج١ / ل٢١١( پەیوەندی نێوان شێرکۆو جمال الدين هۆکارێکی گرنگ بووە لە چارەسەر کردنی ئەم کێشەیەدا) ( السيد الباز العريني : الحروب الصليبية ، ج١ / ل ٥٣٧ )

(١٢) الكامل ، ج ٧ / ل ٧٥ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل ٢٩٨ .

گرتنی دیمەشق لەلایەن شێرکۆوە بایەخێکی مێژوویی گەورەی هەیە چونکە بە شێوەیەکی دبلۆماسی شێرکۆ ساڵی ( ٥٤٦ ك ـ ١١٥١ ز ) لەگەڵ ( بورهانەدین بەلخی ) و براکەی ( نەجمەدین ) ئەیوب ڕێکەوتن بەمەرجێك ناوی نورەدین لەسەر پارەی دیمەشق هەڵکەنرێ و لە خوتبەدا دوای ناوی خەلیفە و سولتانی سەلجوقی ناوی بخوێنرێتەوە ، واتە داننان بەدەستەڵاتی نورەدین بەسەر دیمەشقدا [1] ، لەدواییدا نورەدین داوای لە شێرکۆ کرد ، وەك باڵوێزی حکومەتی حەلەب بچێتە لای فەرمانڕەوایانی دیمەشق و لەو بوارەشدا سەرکەوتنی لەکارەکەیدا بەدەست هێنا [2] .

لێرەدا نموونەیەکی ( عماد ) دەهێنینەوە ، کە ڕۆڵی شێرکۆ دەردەخات لە ژیانی سیاسی سەردەمەکەیدا :

یری برائك مافي الملك یبرمە فأنت منه بحیث السمع والبصرە [3]

لە ساڵی ( ٥٥٤ك / ١١٥٩ ز ) کاتێك نوردین نەخۆش دەکەوێتت ، شێرکۆ وەك نوێنەری حکومەتی حەلەب چووە پێشوازی فەرمانڕەوایی موسڵ لەگەڵ وەزیر جەمالەدین [4] لەهەمان ساڵدا نورەدین شێرکۆی وەك باڵوێزێك بەرەسمی بۆ موسڵ نارد بۆ ئەوەی بەناوی حکومەتی حەلەبەوە سوپاسیان بکات ، ئەمەش پتر پەیوەندی حکومەتی شام و موسڵی بەهێزتر کرد [5] .

گومان لەوەدا نییە کە ئەم هەڵس و کەوتانە پتر ئاستی سیاسی و دبلۆماتی شێرکۆی بەهێز کردووە، تەنانەت لەمیسریشدا وەك دبلۆماتێکی لێهاتوو ناسرا ، تەنانەت لە هێرشی دووەمیشدا توانی لەشکرەکەی لە فەوتان ڕزگار بکات ، چونکە بەهۆی ڕێککەوتنێکەوە توانی سوپاکەی لە چنگ برسێتی ڕزگار بکات لەڕێگای دیلێکەوە کە ناردیانە لایان و لەسەر چەند خاڵێك پێکهاتن ، کە هەموویان لەبەر ژەوەندی لەشکرەکەی شێرکۆ بوون [6]،ئەمە جگە لەوەی دووربوو لە وڵات و زێدی خۆیەوە ، ئەوە بوو دیلەکانی هەردوولا ئاڵوگۆڕ کران ،هەردوولاش میسریان چۆڵ کردوو ، دەبوو بڕی ( ٥٠,٠٠٠ ) دینار بدرێت بە شێرکۆ [7] .بەم شێوەیە ئەم سەرکردە لێهاتوە توانی بەسەرکەوتوویی دبلۆماسیەتی خۆی لەشکرەکەی ڕزگار بکات و بگەڕێتەوە بۆ شام [8]

لەم بارەوە عماد ئەم دیرە بە شێرکۆ دەڵێت :

أسکندر ذکروا اخبار حکمته ونحن فیك راینا کل ما ذکروا [9]

---

(١) النجوم الزاهرة ،ج٥/ ل٣٠١ ؛ابن شاکر الکتبی : عیون التواریخ ،ج١٢ / ل ٤٤٢ ؛ السید الباز العرینی : الحروب الصلیبیة ، ج١ / ل ٢٩٢

Stevenson: The Crusades in the east P .169.

(٢) مفرج الکروب ، ج١ / ل٢٤٢ .

(٣) له الروضتين ، ج١ / ل١٤٥ وەرگیراوە

( بە بیروڕای تۆ دەکات ئەوەی پاشا ئەیەوێت بیکات تۆ بۆ ئەو لەجێگای بینن و بیستنی )

(٤) ذیل تاریخ دمشق .ل ٣٥٦؛ شاکر أحمد ابو بدر: الحروب الصیبیة، ل ٢٤٥.

(٥) مرآ ة الزمان ،ج٨ / ق١ / ل ٢٤٦ ؛ الروضتین ، ج١ / ١٢٣ .

(٦) السیدالباز العرینی: الحروب الصلیبة ، ج١ /ل ٦٨٤ ؛ شاکر احمد ابوبکر :الحروب الصلیبیة ، ل٣٢٥

(٧) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە بەندی دووەم باسی (هە لمەتی دووەم ) ل ١٠٢

(٨) شفاء القلوب ،ل ٣٠ ؛العرینی : الحروب الصلیبة ، ج١ / ل٦٨١ .

(٩) له الروضتين ، ج١ / ل ١٤٥ وەرگیراوە

( خەڵکی باس لە هوشیاری دانشمەندی ئەسکندەر دەکەن

بەڵام ئێمە هەموو خەسڵەتەکانی ئەومان لەتۆدا بینی )

## بەشی سێیەم :
## شێرکۆ لـە بـواری ﴿ کارگـێری و سەربـازی و خزمەتگـوزاریدا ﴾

### یەکەم ـ شێرکۆ لـە بواری کارگـێری و سـەربازی دا

### ١.میرنشینە سـەربازییەکانی :

مەبەست لەم میرنشینانە ئەو زەویانە دەگرێتەوە کە وەك پاداشتێك دەدرانە میرو سەرکردەکان ، تەنها جیاوازیان لە رووی پانتایی ئەو شوێنەوە بوو ، کـە وەریاندەگـرت ئـەمیش بەسـترابوو بـە پلەوپایەیانـەوە لـەناو دەوڵـەتدا [١] .و ئـەم رێـازەش زیـاتر ( سەلجوقیەکان ) پیادەیان دەکرد بەمەبەستی پاراستنی یەك پارچەیی خاکی ئیسلام[٢].

شـێرکۆش هـەر لەسـەردەمی ( عمـاددەدین ) زەنگی‌یـەوە ، وەك سەرکردەیەکـی هەڵکـەوتوو ئەستێرەی درەوشاوەتـەوەو ، خـاوەنی چالاکـی زۆر بـووە ، رۆژ لـەدوای رۆژ دەوڵەتی لە گەشەسەندن و زیادبووندا بووەو لەو زەویانەش کـە خـەڵات کـراوە ناوچـەی ( موزر ) ی بووە [٣] .

دواتر نوردین محمودی کوری زەنگی ئەوەندەی دیکەی خستە سەر ، دوای گرتنی شـاری دیمەشـق لەسـاڵی ( ٥٤٩ك / ١١٥٤ز ) ( رەحبـەش ) ی [٤] پـێ بەخشـی [٥] وە لـە ئـە نجامی هێرشەکانیدا بـۆ میسـر بەتایبـەتی لـە شـاڵاوی دووەمیـدا لەسـاڵی ( ٥٦٢ ك / ١١٦٦ز ) ،نورەدین ویستی بەرامبەر بەو چالاکیانـەی پاداشـتیکی چـاکی بداتەوەکـە لـە ئاسـتی کارەکەیدا بێت لەبەر ئەوە شاری ( حمص )ی [٦] بەهەموو بەشەکانی‌یەوە لە سـاڵی ( ٥٦٣ك / ١١٦٧ز ) دا دایە [٧] شێرکۆ دواتر کە شاری حمص ی وەرگرت کەوتە پتەو کـردن و بـەهێز کردنی سنوری شام ئەویش بە پرکردنەوەی ئەو کەلێن و کە لەبەرانـەی کـە لەناوچەکـەدا بوون ، بەرنامەیەکیشی بۆ دانیشتوانی شاری ( حمص ) لە هەموو دەسـتدرێژیەك دانـا [٨] . ئەو سەرلەشکرو میرانەی کە خـەڵات ئـەکران ، لـەو زەویانـەدا کەدەیاندرایـە چـۆنیان بویستایە بـەو شـێوەیە بـەکاریان دەهێنا پلـەوپـایەیان لـەناوچەکەدا.وەك جێگـری فـەرمـانرەوای شام بوو [٩]

---

(١) صبح الاعشى ، ج٤/ ل٥١: السيد البازالعريني: الحروب الصليبه، ج١/ل٦٠٦.

(٢) محسن محمد حسين : اربيل في العهد الاتابكي ، ل ٢١ – ٢٢ .

(٣) تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل٥٢ ؛ عمادالدين خليل : عمادالدين زەنگی ، ل ٧٧ .

(٤) رەحبە : شارێکە لەنیوان دیمەشق و حەلەبدایە لە حەلەبەوە نزیکترە . (معجم البلدان ، ج٣ / ل ٣٣) .

(٥) الروضتين ، ج١ /ل ١٣٠ .

(٦) حمص: بەناوی یەکێك لە عەمالیقەکانەوە ناونراوە کە بۆ یەکەمجار دروستی کردووە شارەکە لەشێوەی لاکێشەدا بووەو ناوی کۆنی سوریا بووە (رحلە ابن جبیر، ل٢٠٨) ئەم شارە لە دیمەشقەوە سێ رۆژ دوربووە (المسالك والممالیك ، ل٤٨) لە ولاتی شامدا لەسەر ئەو زەویانەی دەدرانە میرو سەرکردەکان دەستووری مولکایەتی لە باوکەوە بۆ کوڕ پیادە دەکرا ، بۆ نموونە بنەماڵەی شێرکۆ پتر لە (سەد) ساڵ شاری حمص بەدەست نەوەکانییەوە بووە بۆیە ناونراوە خانووی بنەماڵەی شێرکۆ . ( العبر في خبر من غبر ، ج٤ /ل ١٨٠ ؛ صبح الاعشی ، ج٤ /ل ١١٢ ) .

(٧) تتمە المختصر في اخبار البشر ، ج٢ /ل ١١٧ ؛ شفاء القلوب ، ل ٣١ ؛ تاریخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل٥٢ .

(٨) سنا البرق الشامي ، ل ٧٠ .

(٩) صبح الاعشی ، ج٤/ ل٥٠

ئەم پەیڕەوە کە نوردین لەسەر ی دەرۆیشت دەستوری سەلجوقیەکان بوو ، دەبوو لەکاتی جەنگدا سەرلەشکرەکان بە هەموو چەك و تفاقێکیان ئامادەبن ،سەرەڕای ئەوەی دەبوو پێداویستیەیە سەربازیەکانیان دابین بکەن [1] شێرکۆ بەشێوەیەکی ناراستەو خۆ سەرپەرشتی ئەم میرنشینانەی لە رووی کارگێر ییەوە دەکرد ، وە لەباری ئاسایدا خۆیشی تیایاندا دادەنیشت وەك رەحبە و حمص [2] ، بەڵگەش بۆ ئەم مەبەستە ئەوەیە لەساڵی ( ٥٥٩ك – ١١٦٣ز )، کە ئاگادر کرایەوە بەرەو میسربڕوات لەشاری ( رەحبە ) وە بەرێ کەوت [3] دیسان لە ساڵی ( ٥٦٤ ك / ١١٦٨ز ) داوای لێ کرا وەك فەرماندەی گشتی بۆ میسر بڕوات ، لەشاری ( حمص )ە وە کەوتە رێ [4] . سەرەڕای ئەمانە ، شێرکۆ وەك چۆن لە کاروباری سەربازیدا شارەزاو بە توانا بووە بەو جۆرەش لە بەڕێوەبردن و کارگێریدا لێهاتوو بووە ، چونکە بەدرێژایی تەمەنی لە میرنشینەکانیدا کێشەیەك رووی نەداوە کە سەرنج راکێش بێت و مێژوونوسان باسیان لێوە کردبێت .

---

(١) السيد الباز العريني : الحروب الصليبية ،ج ١ / ل ٦٠٩ .

(٢) النجوم الزاهرة ، ج ٦ / ل ٥ .

(٣) الروضتين ،ج١ /ل ١٦٦ .

(٤) تاريخ الباهر ، ل ١٣٦ ؛ زبدة الحلب ، ج ٢ / ل ٣٢٦.

## ٢. سوپای ئەسەدییە

لەشکری شام ، لە رەگەزەکانی ( کوردو تورکمان و عەرەب ) پێکهاتبوون ، لەمانەش چەند تیپێکی تایبەتیان لێ رێکخرابوون ، وەك تیپی یارۆقی [١] ، لەگەڵ تیپی ئەسەدییە ، سەرچاوە مێژووییەکان بێ هیچ پێچ و پەنایەك ئاماژە بەوە دەکەن،کە ئەم سەرکردەیە خۆی بەردی بناغەی ئەم لەشکرەی داناوە و رێکی خستووە وەبەناوی خۆشیەوە ناسراوە [٢] ، هەرچەندە لەشکری تایبەتی خۆشی بووە بەڵام جودا نەبووە لە لەشکری شام ،چونکە ئەم تیپە تایبەتیانە، بەشێك بوون لە لەشکری گشتی شام، شێرکۆ لەشکری ئەسەدییەی لە کورد و کۆیلەکان پێك هێنابوو [٣] ، کە ژمارەیان پێنج سەد سەربازێك دەبوو [٤] و خۆی کاروباری بەرێوەبردن و رێکخستن و خەرجییانی دابین دەکرد [٥] ، ئەمەش لەرێگای دەزگای کارگێڕییەوە ئە نجام دەدران ، کە لە شاری حەلەب و دیمەشق سەربەخۆ بوون یاخود لەناو میرنشینە سەربازییەکانی دا، لەو دەزگایانەش ، دیوانی سەربازییە، کەلەم میرنشینانەدا لەبواری بەرێوەبردن و داراییدا رۆڵی خۆی بینیوە [٦] لە پاڵ ئەو کارانەدا ، کاری پەیداکردنی زانیاری تەواو دەربارەی سەربازەکانی میرنشینەکە لەبارەی دەستنیشان کردنی پێداویستییەکانیان و ساز کردنی ژمارەیان لەگەڵ دابینکردنی موچەیان ، چونکە پاراستنی ناوچەکەیان لەئەستۆدا بوو [٧]، ئەم ئەرکانەش بەخاوەن قەڵەم دەسپێردران ، کە میرەکان هەڵیان دەسوراندن [٨] بەڵام شێرکۆ خۆی بەکاروباری سەرپەرشتی و کارگێڕی هەڵدەستاو هەندێ جاریش جێگری دادەنا ، لەو جێگرانەش ( صلاح الدین ) ی برازای بوو ، کە لەساڵی ( ٥٤٦ ك / ١١٥١ ز ) دا لەشاری حەلەب دێتە لای و تا ساڵی ( ٥٥٠ ك/ ١١٥٥ ز ) لەگەڵیدا دەمێنێتەوە [٩] ، لەشاری دیمەشق ( توران شاه ) ی برای دەکاتە جێگری خۆی لە دیوانی سەربازیدا [١٠] ، لەم دیوانەدا لە پاڵ ناوی سەربازە تایبەتییەکانی شێرکۆدا ، ناوی بەکرێ گیراوانیش لەکاتی شەڕەکاندا تۆمار دەکران [١١] .

---

(١) تیپی یارۆقی: سوارەی تورکمان بوون لەتیرەی یارۆقی بوون سەرکردەکەشیان ناوی ( عین الدولة ) یارۆقی بوو(هاملتون: صلاح الدین، ل١٥٤)

(٢) الروضتین ، ج١ / ل٢٧٣ ؛ تاریخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج ١ / ل ٥٦ ؛ دائرة المعارف الاسلامیة ، مجلد ١٤ / ل٣١ .

(٣) تاریخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل٥٦ ؛ خاشع المعاضیدي و اخرون : الوطن العربي و الغزو الصلیبي ، ل١٢٩ .

(٤) تاریخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل٥٦ ؛ هاملتون : صلاح الدین ، ل١٥٥ .

(٥) السید الباز العریني : الحروب الصلیبیة ، ج١ / ل ٦٠٢ ، ث ٣ .

(٦) الخطط ، ج١ / ل١٦٨ ـ ١٦٩ .

(٧) عماد الدین خلیل : عماد الدین زنكي ، ل١٩١ .

(٨) ابن خلدون : المقدمة ، ل١٨٠ .

(٩) الروضتین، ج١/ ل٨١؛ السید البازالعریني: الشرق الادنى والایوبیون، ل٢٩.

(١٠) الروضتین ، ج١ / ل ١٠٠ ؛ هاملتون : صلاح الدین ، ل ١١٨ .

(١١) المواعظ والاعتبار، ج١ / ل٤٠١ .

لەشکری ئەسەدییە بەبەردەوامی لە بەجێهێنانی ئەخشەو فرمانەکانی شێرکۆی سەرکردەیاندا ، چ لە شام دژی خاچیەکان وە یا دژی ( ضرغام و شاور ) لە شارەکانی میسردا، ڕۆڵی جوامێرانە و لەبەر چاویان هەبووە [1] ،لەناو ئەم لەشکرەدا پیاوانی ناودارو زانای مەزنی وەك ( عیسا ) ی هەکاری تێدا بوو [2] ، وە ئەوەی پێویستە بگوترێت؛ ئەوەیە کە ئەم لەشکرە دوای کۆچی سەرکردەکەشیان ، ناویانگیان لە ئازایەتیدا بەردەوام لەدەست نەداوە [3] ،وەك ئەو ڕۆڵە سەرەکیەی کە لە پشتگیری کردنی ( سەلاحەدین ) بینییان لە کاتی دانانی دا بۆ وەزارەتی میسر [4] و هەر هەمان لەشکر پشتگیریان لە ( سەلاحەدین ) کرد دژی پیلانەکانی ناو کۆشکی فاتمی و ڕزگاریان کرد [5] .



---

(١) درید عبد القادر : سیاسة صلاح الدین ، ل ٩٠ .

(٢) الکامل ، ج ٧ / ل٣٧٠. بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی عیسای هەکاری بڕوانە : د. ئەبەز مجید ئەمین : عیسای هەکاری ، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی/ بەشی زانستە مرۆڤایەتیەکان / ژمارە ٧ / ساڵی ٢٠٠١

(٣) دائرة المعارف الاسلامیة ، مجلد ١٤ / ل٣١

(٤) الروضتین ، ج١ / ل ١٧٣ : اتعاظ الحنفا ، ج٣ / ل٣٠٨ .

(٥) شفاء القلوب ، ل٧٢ : العرینی : الشرق ادنی و الایوبیون ، ل١٥٥ .

بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی لەشکری ئەسەدییە پاش کۆچی دوایی شێرکۆ بڕوانە تاریخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج٢ / ل ١١ ، ٦٨ ، ٨٢ ، ١١٢ ، ١٢٥ .

### ٣. ڕۆڵی ئه‌ ئه‌نجومه‌نی جه‌نگ دا

ئه‌نجومه‌ن ؛ ده‌سته‌یه‌کی باڵای سوپا بوون، له‌ئاڕاسته‌کردنی سیاسه‌تی جه‌نگ و دانانی نه‌خشه‌و پلانی سه‌ربازی و گه‌لێك جاریش له‌به‌ڕێوه‌بردنی ده‌وڵه‌تدا به‌شداریان کردووه [1]، سوڵتان نوره‌دینیش بایه‌خی زۆری به‌م ئه‌نجومه‌نه‌ ده‌دا ، به‌هۆی نزیکبوونیان له‌ سنووری ده‌سته‌ڵاتی خاچیه‌کانه‌وه‌، که‌ هه‌میشه‌ له‌گه‌ڵ یه‌کدا له‌کێشه‌و ململانێی به‌رده‌وامدا بوون ، بێگومان شێرکۆ ئه‌ندامێکی چالاکی ئه‌نجومه‌ن بوومو ڕۆڵی له‌به‌رچاوو کاریگه‌ری له‌ زۆربه‌ی ڕوو داوه‌کانی شام و ده‌وروپشتیدا بووه‌ [2]، و له‌ هه‌موو ئه‌و هێرش و شاڵاوانه‌ی نوردین کردویه‌تی‌یه‌ سه‌ر دوژمن ، به‌شدار بووه‌ [3] و زۆربه‌ی ساته‌کانی ژیانی لای نوره‌دین له‌ سه‌ربازگه‌دا به‌سه‌ر بردووه‌ ، به‌جۆرێك که‌ شێرکۆ به‌ئاگا بووه‌ له‌ سه‌رجه‌م کێشه‌کانی ده‌وڵه‌ت و ڕۆڵی سه‌ره‌کیشی له‌چاره‌سه‌رکردنیدا بینیووه‌ [4] ئه‌ندامانی ئه‌م ئه‌نجوومه‌نه‌ له‌ ژماره‌یك سه‌رله‌شکری ناوداری سوپاکه‌ی نوره‌دین پێکهاتبوو، وه‌ك شێرکۆ ، ( کمشته‌کین ) [5] و ( میری میران ) [6] وه‌ له‌میره‌کانیش ئه‌جمه‌دین ئه‌یوبی برای شێرکۆو ژماره‌یه‌کی دیکه‌ش بوون ، شێرکۆ به‌ئه‌ندازه‌یه‌ك له‌ده‌وڵه‌تدا پایه‌بلند بوو هه‌رده‌ تگوت له‌ فه‌رمانڕه‌وایدا هاوبه‌شه‌ [7] و گه‌وره‌ترین میری شام بووه‌ لای نوره‌دین [8]، ته‌نانه‌ت نوره‌دین بێ پرس و بۆچوونی ئه‌و شتێکی ئه‌و تۆی ئه‌کردووه‌ [9] ئه‌وه‌تا ( به‌هائه‌دین ئبن شه‌داد ) ده‌ڵێت ؛ سوڵتان صه‌لاحه‌دین بۆی گێراومه‌ته‌وه‌.که‌ نوره‌دین ناردوومی بۆلای مامم ( شێرکۆ ) به‌بێ ڕه‌زامه‌ندی ڕای مامم هیچی نه‌کردووه‌ چ له‌کاری به‌ڕێوه‌بردندا بوویێت و یاخود له‌ نه‌خشه‌دانانی شه‌ڕدا بوویێت، ده‌ڵێت: ڕاسپارده‌که‌ په‌یوه‌ندی به‌ سه‌ربازه‌کانه‌وه‌ بوو، پێی گوتم : بچۆ بۆلای مامت و پێی بڵێ سوڵتان ده‌بێژێت : له‌خه‌یاڵمدایه‌ هه‌موو ده‌سته‌به‌ر کردنێك، که‌ په‌یوه‌ندی به‌زه‌خیره‌و ( المؤن و المکوس )ه‌وه‌ هه‌یه‌ ئه‌هێڵم بزانه‌ ڕای مامت چی‌یه‌؟

---

(١) الروضتين ، ج١ /ل ١٥ .

(٢) الكامل ، ج ٧ / ل ٢٠٠ ؛ الروضتين ، ج١ /ل ٢١١ .

(٣) تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ /ل ٥٢ ؛ محمد سهيل طقوش : تاريخ الأيوبيين ، ل ٩ .

(٤) حسين مؤنس : صور من البطولة ، ل ٢٥٤ .

(٥) که‌مشته‌کین: یه‌کێك بوو له‌سه‌ر له‌شکره‌کانی نوره‌دین، دوای نوره‌دین له‌گه‌ڵ مه‌لیك (صالح)دا بوو قه‌لای حارم تا له‌ساڵی (٥٧٣ ك / ١١٧٣ ز) کوژرا (الكامل، ج٧ / ل٢١٥ـ٢٧١؛ وفيات الاعيان، ج٧/ل١٦٨

(٦) میری میران : برای سوڵتان نوره‌دین محمود بووه‌ و له‌گه‌ڵیا بووه‌ له‌ شام ، له‌ شه‌ڕی ( بانیاس ) دا چاوێکی له‌ده‌ست داوه‌ ساڵی ( ٥٦٠ ك / ١١٦٤ز) له‌ دیمه‌شق مردووه‌ . ( شذرات ، ج٤ / ١٨٨ )

(٧) تاريخ الباهر ، ل ١٦٨ .

(٨) مفرج الكروب ، ج ١ / ل ١٠ .

(٩) ابن قاضي شهبة الاسدي : الكواكب الدريه في السيره النورية ، ل ٤٢ ـ ٤٣.

( سەلاحەدین ) دەڵێت : پاش گەیشتنم بۆ لای مامم گوتی بگەڕێوەو پـێی بڵـێ: گەورەم ئەگەر کاری وا لەگەڵ سەربازەکاندا بکەین ، کە خۆراکیان لەسەر ئەوانەیە تۆ لـە خوێوە دەیاندەیتێ، لەکاتێکدا هەمیشە پێویستت پێیانە لە غەزاکردندا لەگەڵتا بن"[1].

ئەمانە هەموو بەڵگەی ئەوەن کە ئەم قارەمانە، چاپووك و چـالاك بـووە لـەو ئە نجوومەنەداو رای خـۆی بەشـێوەیەکی راسـتەوخۆ دەربڕیـوەو کـاری پێکـراوە لەلایـەن نورەدینەوە ، چونکە دەیزانی دڵسۆزەو لەهەمان کاتدا کارامەو لێهاتووشە لە شەڕدا.

هەر لەو بارەیەوە ( ولیم صوری ) دەڵێت : " شێرکۆ هەموو کاتێك سەر دەسـتەی سوارچاکە دلێرەکانی نورەدین بووە"[2] و لە چالاکیە سەربازەکانیدا رۆڵی لەبـەر چـاوی بووە ،وەك گرتنی دیمەشق لەسالی ( ٥٤٩ ك / ١١٥٤ز) دا"[3] . هـەروەها لـەکاتی نـەخۆش کەوتنی نورەدین لە ساڵی ( ٥٥٢ ك / ١١٥٧ ز ) دا لەو بریارەیدا ، کـە ئـە نجامی متمانـەی زۆری بوو پێی جلە و فەرمان رەوایی شاری دیمەشق دوای خۆی بگرێتە دەسـت"[4] . سـەرباری ئەمانە هەمووی لە کۆکردنەوەو ئامادە کردنی سوپادا بـۆ جـەنگ زۆر لێزان و بـە توانـا بووە ، بە تایبەتی میرە تورکمانـەکان و پێشـەواکانیان، کـە هـەردەم شێرکۆ خـۆی لـە پێشیانەوە بووە بەزیرەکی و هوشیاری خۆی هەردوو بالی سوپاکەی ( چەپ و راست ) ی دەدا بەو میرانەی کەناودار بـوون بـە ( دەسـت وەشـێن و توندەکـان )"[5] ، لـێرەدا ئـەم دێـرە هۆنراوەیەی عمادەدین دەخەنە بەرچاو، کە چۆن رۆڵی هەبووە لەم ئە نجومەنەداو دەلێت:

یسرت فتح البلاد کان أیسرها      لغیر رأیك فقفلا فتحه عسیر[6]

---

(١) لە الروضتین ، ج١ / ل ١٥ ، ١٠٠ وەرگیراوە .

(٢) لە السید الباز العرینی : الحروب الصلیبة ، ج١ / ل ٦٦٧ وەرگیراوە .

(٣) مفرج الکروب ، ج٢ /ل ١٦٥ .

(٤) ذیل تاریخ دمشق ، ل ٣٤٩ ـ ٣٥٠ ؛ الروضتین ، ج ١ / ل ١٠٩ .

(٥) شاکر أحمد ابو در : الحرو الصلیبة و الاسرة الزنکیە ، ل ٣٠٤ .

( ٦ ) الروضتین، ج١/ ل١٤٥؛ محمود السرطاوی : نورالدین والادب ، ل٩٢،٩٠.

( لات ئاسانە گرتنی وولات لە هەمووشیان ئاسانتر بەبیری تۆ نەبێت داخراو زۆر گرانە )

## بـــاســـی دووەم

## شـێـرکـــۆ لە بواری خزمەتگوزاری دا

### ١. لە بواری زانستی دا

لەسەرەتادا مزگەوت مەڵبەندی خوێندنی زانستی ئیسلامی بـــووە، تـــا لەســـاڵی ( ٤٠٠ ك / ١٠٠٩ز) جێگەی تایبەتی بۆ دیاریکراو ناوی خوێندنگای لێ نرا[١] ، میرەکان لـــەم بوارەدا رۆڵی خۆیان بینیوە بەهاندانی خوێندکاران و خەڵات کردنیان، لەگەڵ دابین کردنی خەرجی و مامۆستاو بواری خزمەتگوزاری بەمەبەستی پەروەردەکردنی خوێندکاری موسوڵمان و فێرکردنی زانست لەگەڵ خزمەتکردنی ئایین و زمانەکەیان[٢] .

خوێندنگاش وەك دەزگایەکی رێکخـراو هـەندێکیان پاشـکۆی مزگـەوت بـوون و هەندێکیشیان سەربەخۆ بوون[٣] . زۆربەی ســەرچاوە مێژوویـیـەکان دەڵێـن : بـۆ یەکـە مجار خوێندنگا لە ( نیسابوور ) لەساڵی ( ٤٠٠ ك / ١٠٠٩ز ) دا دروستکراوە[٤] لەدوای ئەوان ( نظـام الملك ) وەزیری سەلجوقیەکان ساڵی ( ٤٥٧ك / ١١٦٤ ز ) لە بەغداد دروستی کردووە[٥].

بەم شـێوەیە بـواری بزووتنـەوەی زانیـاری فـراوان بـوو بـەزۆربوونی ژمـارەی خوێندنگاکان لەجیهانی ئیسلامیدا بەگشتی و لە ( شام ) دا بەتایبەتی لە زیادبووندا بـــوو وە سەردەمی سوڵتان ( نورەدین ) و میرەکانی شامیان روونـــاك کردبـــوو بـــوە ، شـێرکۆ لـــەم بوارەدا سەر بڵند بوەو شوێن دەستی رەنگینی دیار بووە لـــە دروسـت کردنــی خوێندنگـــا لـــە شارەکانی حەلەب و دیمشق دا[٦]

شێرکۆ بەوە ناسراوبوو ، کە پیاوانی زاناو زانستخوازی خۆشویســـتووە هەمیشـــە پشــتگیری کــردون و یارمەتیشــی داون[٧] ، و هــەموو شــەوێك لەگــەڵ ئــەم پیاوچاکانـــە دانیشتووەو گفتوگۆی لەگەڵ کردوون و بەردەوام هانی داون بۆ زیاتر خزمەتکردن لـــەبواری پەروەردەکردنی رۆڵەی موسوڵمانانـدا[٨] .

---

(١) خطط ، ٤ /ل ١٩٢ .

(٢) محمد كرد علي: خطط الشام، ج٦/ ل٦٧؛ احمد شلبي : تاريخ التربيه الاسلامية ، ل ١١٣ — ١١٤ .

(٣) احمد احمد بدوى: الحياة العقليه في عصرالحروب الصليبيه ، ل٣٠ ؛ ناجي معروف: نشأة المدارس المستقلة، ل٢٥.

(٤) المقريزي : المواعظ والاعتبار بذكر الخطط والاثار، ج٤ / ل ١٩٢ ؛ محمد كرد علي : خطط الشام ، ج٦ / ل ٦٧ .

(٥) الكامل ، ج ٦ / ل ٢٣٦ ؛ وفيات الاعيان ، ج ١ / ل ٣٩٦ ؛ حسين امين : العراق في العصر السلجوقي ، ل ٢٢٠ .

(٦) العبر في الديوان المبتدا والخبر ، ج ٥ /ل ٢٥٣ ؛ النعيمي : الدارس في التاريخ المدارس ، ج ١ / ل ١٥٢ .

(٧) الروضتين ، ج١ ل ١٧٢ .

(٨) سنا البرق الشامي ، ل ٦٥ ؛ سيد علي الحريري : اخبار السنية و الحروب الصليبية ، ل ١٣٦ .

ئەم پیاوە زۆربەی ژیانی سەرقاڵی شەڕبووە لەگەڵ ئەوەشدا لەم مەیدانەشدا سوارچاك بووە، ئەمەش ڕێگەمان پێئەدا بڵێین: شێرکۆ بەدەستێکی، بەشمشێرخزمەتی خاکی ئیسلامی کرد، وە بەدەستەکەی دی هانی قەڵەمی داوە بۆ خزمەتی شارستانێتی و ڕۆشنبیری ئیسلامی.شارێکی وەك حەلەب ( پێنج ) خوێندنگای تێدابووە[1] ، یەکێك لەو خوێندنگایانەی شێرکۆ دروستی کردووە لە گەڕەکی ( دەرگای قنسرین ) وە لەسەر ڕێبازی ( شافعی ) بووە[2] و ناوی ( ئەسەدییە ) بەکارهێنراوە بۆ ئەو خوێندنگایانەی دروستی کردوون لە ( حەلەب ) یان لە ( دیمەشق )[3]. ئەوەندە خۆشەویست بوەو خاوەن ڕێزبووە کەسانی تریش وەك ( بەدرەدینی ) خزمەتکاری خانووەکەی خۆی کردووە بەخوێندنگا بە ناوی ( ئەسەدییە ) وە لەبەرامبەر قەلای ( حەلەب ) لەو شوێنەی ناسراو بووە بە ( طلواشیة )[4] ، هەروەها پاش گرتنی دیمەشق لەوێش وەك چۆن هەمیشە لە پێشەوەی کاروانەکانەوە بووە خوێندنگای ( ئەسەدییە )ی دروست کرد[5] . و لەم خوێندنگایەدا هەردوو مەزهەبی شافعیو حەنەفی تێدا خوێندراوە[6] . شوێنەکەی نزیك گۆرەپانی سەوز بووە[7] ،سەرباری ئەوەی خۆی دروستی دەکردن کەم و کووڕی خوێندنگاکانیشی بەلاوە جوان نەبووە لەبەر ئەوە ئاوەدانکردنەوەی خوێندنگای ( جەمیلە ) ی خستۆتە ئەستۆی خۆی[8] .

پێشکەوتنی شام لەبواری زانستیدا گەیشتە ڕادەیەك، کە پێی دەوترا ـ مەڵبەندی زاناو شەرع زانەکانی جیهانی ئیسلام ، هەموو خەرجیو پێداویستی خوێندنگاکان لەدارایی تایبەتی خۆیان دەکرا[9] .

---

(١) رحلة ابن جبير ، ل ٢٠٤ .

(٢) الروضتين ، ج ١ /ل ١٧٢ : االدارس في تاريخ المدارس ، ج٢ / ل ٤١٢ ؛ محمد الحلب الحنفي : در المنتخب ، ل ١١٢ ؛محمود السر طاوي : نور الدين في الادب العربي ، ل ٤١ .

(٣) دائرة المعارف الإسلامية ، مجلد ١٤ /ل ٣١ .

(٤) محمد كرد علي : خطط الشام ،ج٦ / ل ١١٠ ـ ١١١ ؛ در المنتخب ، ل ١١٩ ؛ احمد احمد بدوي : الحياة العقلية في عصر الحروب الصليبية ، ل ١١٩ .

(٥) الاعلاق الخطيرة ، تاريخ دمشق ، ل ٢٦٢ ؛ شفاء القلوب ، ل ٢٥ .

(٦) الروضتين ، ج ١/ل١٣٢؛ الحياة العقلية في عصر الحروب الصليبية، ل٣٢.

(٧) الروضتين ، ج ١ / ل ١٧٣ ؛ تاريخ دمشق ، ل ٢٦٢ ؛ الدارس في تاريخ المدارس ، ج١ / ل ١٥٢ .

(٨) الحموي : التاريخ المنصوري ، ل ٤١٨ .

(٩) ياقوت الحموي : معجم الأدباء ، ج ٢ /ل ٢٧٠ ؛ محمد كرد على : خطط الشام ، ج٦ /ل ٦٩ .

گرنگی پێدانیان گەیشتبوە ئەو ئاستەی کام مامۆستا بەناوبانگ و کارامە بوایە لە ( عیراق ) یان بەشەکانی دیکەی ( شام ) یان لە ( میسر ) بۆلای خۆیانیان دەهێنا [1].
شێوەی بینای خوێندنگاکان لە هۆڵی وانە ووتنەوە لەگەڵ شوێنی تایبەتی حەوانەوەی خوێندکاران و مامۆستاکان پێکهاتووە، و ئەگەر جیاوازیش بووبێت تەنها لە رووی پانتاییەوە بووە یان هاوشێوەبوون و بە گشتی روویان بەرەو قیبلە بووە [2] .

شێرکۆ جگە لەخۆی بنەماڵەکەشی بە پیاو و ژنەوە دەستێکی بالآیان لەو خزمەت کردنەدا هەبووە [3] ، هەروەها ئەم بەرنامەیە بەشێکی گرنگ بووە لە نەخشەی خزمەتکردنی مەزهەبی ( سوننی ) لەناوچەکەدا، سەرەرای وروژاندنی پەرۆشی خەڵکی بەلای ئایینی ئیسلامدا دژی خاچیەکان [4] .

لێرەدا ئەم دێرە هۆنراوەیەی ( سابق أبو یمن ) دەنوسین ، کە وەسفی خوێندنگاکانی حەلەب دەکات، کە جۆرەها زانستی تێدا خوێندراوەو دەڵێت :

فلديها كل فنون فيها ما أشتهاه الشرعي و الفلسفي [5]

---

(١) تاريخ الباهر ، ل١٧٠ ؛ ناجى معروف : نشأة المدارس ، ل٢٥ .

(٢) رحلة ابن جبير ، ل٢٣٠؛ عبداللطيف حمزة: الحركة الفكرية في مصر، ل٨٠.

(٣) ترويح القلوب في ذكر الملوك بني ايوب ، ل٣٧ ، ٥٢ ، ٧٨ ، ٧٩ ، ٨٤ ؛ محمد كرد علي : خطط الشام ، ج٦ / ل ٧٨ ، ٨٦ ، ٨٧ ، ٨٩ ، ٩٩ .

(٤) الروضتين ، ج١ / ل ١٧٣ : خطط ، ج١ / ل١٠٩ ؛ عبد اللطيف حمزه : الحركه الفكريه فى مصر ، ل٣١ ، ٨١ ، ٨٢ .

(٥) لە خطط الشام ، ج٦ / ل٧٠ وەرگیراوە .

## ٢. لـه بـواری ئـــاییندا

### أ ـ دروست کردنی مزگەوت

شێرکۆ وەك سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژەی بۆ دەکـــەن ، خـــاوەن بیروبـــاوەڕێکی پتەو بووە، هەموو هۆش و خەیاڵی لەلای بەدیـــهێنانی یـەك پارچـەیی خـاکی ئیسـلام و پاراستنی موسوڵمانانـدا بووە [١]. زۆر مەردانەش بەرگری لە ئـــایینی خـۆی کـردووە ، بـە شێوەیەك لەکاتی شەڕیشدا ڕۆژووی خـــۆی گرتـــووە . ( ئیـبن ئـەثیر) دەڵێـت : " لـەکاتی گەمارۆی ئەسکەندەرییە و ڕۆیشتنی بۆ صعید مانگی ڕەمەزان بوو خۆشی بەڕۆژوو بـــوو " [٢].

سەردانی گۆڕومـەزاری پیاوچاکانی کردووە، بۆ نموونە لەکاتی گرتنی ( شاور ) دا ئەم زاتە لە سەردانی گۆڕی ئیمامی شافعی بوو [٣] .

جگە لـەوە شـێرکۆ ( دوو ) مزگـەوتی لـە شـاری دیمەشـقدا دروسـت کـردووە ، یەکەمیان مزگەوتی ڕۆژئـاوایە ، کە بیناکەی زۆر گەورە بووە [٤] و دووەمیـــان بـە مزگـەوتی هەڵواسراو ناسرابوو ، کە لە نزیك گەرماو و ئاوکێشەکان ( الحمام و السـقایه ) دا بـــوو ، کە ئێستا ناسراوە بە ( ئیبن حەسان ) وە لـــە دەرەوەی ئـەو دەرگایەدایـە کـە بـــە دەرگـای ( جابیه ) ناودارە [٥]، لەگەڵ ئەم ڕەفتارە بەرزەشدا زۆر مشورخۆر بووە بۆ مزگەوتەکان.

یەکێك لەو نموونـانە ئەوەیە کە ساڵی ( ٥٥٩ك / ١١٦٣ ز ) لە کـاتێکدا کـە لـە میسرەوە بۆ شام دەگەڕایەوە و گەیشتەوە شام ، هەر لەو ڕۆژەدا لە کۆشکی ( جیرون ) ئـــاگر کەوتەوە ، کە جێگاکەی لە یەکێك لە مزگەوتەکانەوە نزیك بوو ، ئـــەم جوامـێرە لەگـەڵ میرەکانی دیکەدا ڕووی لە شوێنی ڕووداوەکە کرد و کەوتنە کوژاندنەوە و خـــامۆش کردنـــی بڵێسەی ئاگرەکە ، بۆ ئەم مەبەستەیش سەرچاوەکان باسیان لەم کـــارە کـردووە کـە چـۆن مزگەوتەکەی لە سوتـان ڕزگار کردووە [٦] .

ئەم هەڵوێستە لە ئەدەبی ئەو ڕۆژگارەدا ڕەنگی داوەتەوە ، ئەوەتا ( عەرقەلـــە ) لە دوو دێڕ شیعردا ستایشی شێرکۆ دەکات و دەڵێت :

ولقد ردها بعزم و حزم | اسد الدين غـــاية المسكين
و حمى الجامع المقدس | و المشهد من جمرها بماء معين [٧]

---

(١) الروضتين ، ج١ / ل١٧٢ ؛ البداية والنهاية، ج١٢/ ل٢٥٩ ؛حسين مؤنس: نورالدين محمود، ل٣١٨.
(٢) الكامل ، ج٧ / ل١٩٠ .
(٣) الكامل ، ج٧ / ل١٩٩ .
(٤) الاعلاق الخطيرة (تاريخ دمشق ) ، ل١٥١ ؛ الدارس في تاريخ المدارس ، ج٢ / ل٢٥٧ .
(٥) تاريخ مدينة دمشق ، مجلد ٢ / ق١ / ل ١١ .
(٦) البداية و النهاية ، ج١٢ / ل ٢٤٨ .
(٧) الروضتين ، ج١ / ل١٣٢ .
( بەلام گێڕایەوە بەتواناو دەسەڵاتی شێـــرکۆی پەنـــــای هـــەژاران
مزگەوتی پیرۆز جێگـــــــای پیرۆزی پاراست بە ئاوی کانی و خاوێنی )

## ب ـ دروست کردنی خانەقا [1]

خانەقا لەناو خاکی ئیسلامدا ، لەدەوری سەدەی ( چوارەمی ) کۆچیدا پەیدا بووە و سەری هەڵداوە ، بۆ خواپەرستە سۆفییەکان شوێنێکی تایبەتی بووە [2] ، و لە بواری ئایینی و لەسەر ژیان و بیری کۆمەڵایەتیش ڕۆڵی کاریگەری بووە، بەشێوەیەك بوو بوونە بارەگای زانایانی ئیسلام ، کۆڕو کۆبونەوەکانیان بەڕێنمایی کردنی موسوڵمانان لەبواری ئایینیدا دەگێڕا، چونکە ئەو کەسانە بایەخیان بەخۆراك و خواردنەومو خۆشی و ڕابواردن نەدەداو پشتگوێیان دەخست ، بەڵکو هەمیشە لەم مەڵبەندانەدا بۆ زانست لەکاردا بوون و خەریکی ووتنەوەی وانەو بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و ڕۆشنبیری ئیسلامی بوون لەناوچەکەدا [3] . هەروەها ئەو شوێنانە ئەو کەسانەی دەگرتەخۆ ،کە لە شوێنی دیکەوە هاتبوون و بەو جێگەیە ئاشنا نە بوون و نامۆ بوون [4] ، هەندێك لەم خانەقایانە وەك شوێنێکی کۆمەڵایەتیان لێ هاتبوو پەککەوتەکانی لەکوێرو نەخۆش و کەمئەندامانی تیادا کۆ دەبوونەوە خزمەت و کۆمەکیان پێشکەش دەکرا لە خۆراك و خواردنەومو پۆشاك، لەلایەن ئەو کەسانەوە کە لەتەکیەکاندا دانرابوون و خزمەتیان دەکردو بەرامبەر بەو کارەیان موچەیان دەدرایە ، ئەمەش کارێکی خێرخوازی بوو لە پێناو دورخستنەوەو ڕزگارکردنیان لە دەروەزەیی ( سواڵکردن ) [5] .

شێرکۆی خانەدان لەم بوارەشدا جێ دەستی دیاربوو هەمیشە وەك خاوەن باوەڕێکی ڕاستەقینە ، کە ژیانی سەرجەم خەبات و تێکۆشان بوو لە پێناوی بیرو باوەڕی ئیسلامدا، بە ماڵ و سامانیش درێغی نەکردووە ، ئەمەش جوانترین کردەوەی بووە ، کە جگە لە غەزاکردن بەئەرکی سەرشانی خۆی زانیوە ، لەبەرئەوە خانەقای ( ئەسەدییە )ی لەناو دەرگای ( جابیە ) لە دیمەشق دروستکردووە ،لەگەڕەکی ( هاشمیە )ی کۆن [6]. شێخ ( ئەجمەدین )ی قورەیشی عەبباسی پیری خانەقاکە بووە لەگەڵ چەند خواناسێکی دیکەدا، لە شاری دیمەشقدا ژمارەی خانەقاکان بەڕادەیەك لە زۆربووندا بوون، تا گەیشتە ( بیست و شەش ) خانەقا ، زۆربەیان لەلایەن بنەماڵەی ئەم شازادەیەوە بنیاتنراون.[7]

---

(١) خانەقا : ووشەیەکی فارسی‌یە لەبنچینەدا ووتراوە (خونکاە) واتا ئەو شوێنەی پاشا نانی تیا ئەخوات ، وە گۆشەی دەروێشەکان بووە. بەم شێوەیە نەزانرابوو تاسەدەی شەشی کۆچی . (خطط ، ج٤ / ل٢٧١ ؛ محمد كرد علي: خطط الشام ، ج٦/ ل١٣٢).

(٢) صبح الاعشى ، ج١٢ / ل١٠٣ ؛ خطط ، ج٣ / ل٣٩٩ ، ل٤٢٢ .

(٣) صبح الاعشى ، ج١٢ /ل ١٠٣ ؛ محسن محمد حسين : اربيل في عهد الاتابكي ، ل٢٥٤ .

(٤) محمود السرطاوي : نور الدين في ادب العربي ، ل٣٣ .

(٥) وفيات الاعيان ، ج٣ / ل٢٧٢ ؛ اربيل في عهد الاتابكي ، ل٢٣٩ .

(٦) الروضتين، ج١/ ل١٧٢ ؛ الاعلاق الخطيرة ( تاريخ دمشق ) ، ل١٩٢ ؛ البداية والنهاية، ج١٢/ ل٢٦٠؛ الدارس في تاريخ المدارس ، ج٢ / ل١٥٩ .

(٧) رحلة ابن جبير ، ل٢٣١ ؛ خطط الشام ، ج٦ / ل١٣٤ ،

(٨) بۆ زانیاری دەربارەی ڕۆڵی ئەم بنەماڵەیە بڕوانە ( خطط الشام ، ج٦ / ل١٣٠ ، ١٣٤ ، ١٣٥ ، ١٣٦ ، ١٣٧ ) ) .

## ج ـ دروست کردنی ڕەبات [1] ( الرباط )
## ( کـــەمـــەن کێشـــی )

**مەبەست لەو خانووە بچوکانە بووە، کە لــە دەرەوەی شــارەکان بــۆ خواپەرسـتی دروستکراون [2]، لەو تێڕوانینە کە ئەم بنکانەش تیشکی بانگەوازی ئیسلامیان لێــوە بـڵاو دەبووەوەو فەرمانە ئاینییەکانیان تێدا بەجێهێنراوە بایەخیان لەمزگەوت کەمتر نـەبووە [3]. بەڕادەیەکی زۆر لەشێوەی تەکیەدا بڵاو بووبوەوە بەتایبەتی لە ( عێراق ) دا ڕۆژلـەدوای ڕۆژ گۆڕانیان بەسەردا دەهات و گەشەیان دەکردولەبواری ڕۆشنبیریدا هەنگاوی بەرەوپێشـی دەنا، وەك پێدانی مۆڵەتی وانەووتنەوە وانەی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) [4].**

**سەرەڕای لایەنی زانستی ، زۆرینـــەی ئـــەم شـوێنانە کتێبخانــەی پـڕ لــەکتێبی پێشکەوتووی تێدا بووە و زۆر لە کەمەن کێشان لە ژیـــان دابڕابــوون و بــەردەوام خــەریکی خوێندنــەوەو وانــە خوێنـــدن بـــوون وەك خوێندنگـــا [5]، وە زۆر کتێبـی بـەنرخ و بابــەتی بەپێزیان تێدا نوسراوەتەوە [6] و ئەم شوێنانە لەگەڵ خواپەرستیدا جێگەی دانانی کتێــب و پۆلێن کردنی بوون [7] بە ڕادەیەك بوونە شوێنی زانـــاو خــەڵکانی چــاك، وەك شــوێنێکی زانستی و وێژەیی و کۆڕی ئامۆژگاری و ڕێنمایی بێت، نـــەك وەك بنکەیـەك بــۆ پــەنادانی بێکارو تەمەڵەکان [8]، بەڵگەش بۆ ئەو دانەرانە ( ئەبو بەکری حازم ) ی بـــوو، کــە کتێبـــی ( الناسخ و المنسوخ ) ی داناوە لەفەرمودەکانی پێغەمبەردا (د.خ) وە کتێبی ( عجالە المبتـدی ) کە لە بارەی ڕەچەڵەکەوە نوسراوە [9].**

**ئەوکەسانەی بەشداری ژیانی ئەم خانوانەیان دەکرد ســـەرباری خواپەرسـتییان فێری ڕاهێنـانی دەروونی و زاڵ بوون بەسەر ئارەزووەکانی و گۆشەگیری دەکران.**

---

(١) ربط : ئەو ناوەیە کەبەستراوە بەشتێکەوە، واتە پێچراوەتەوە، واتە مانەوە بۆ غەزاکردن لەگەڵ دوژمن، وە ئەم ڕەباتانە لەڕووی خواپەرستیشەوە لەگەڵ خانەقا هاوتایە، بەڵام جیاوازی لەوەدایە ڕەبات جگە لەلایەنی ئاینی بواری جەنگیش دەگرێتەوەو خۆشی لەبنچینەدا ناوێکی جەنگی هەبووە وەمەبەستی لەشارەکانی سەر سنوور بووە کە سەربازە غەزاکەرەکانی تێداکۆدەکرانەوە بەرامبەر بەدوژمنان . (خطط، ج٣/ ل٢٩٩، ج٤/ ل٢٩٢؛ احمد عطية: القاموس الاسلامي، ج٢ / ل٤٨٧ )

(٢) خطط، ج٣/ ل٣٩٩، ٤٢٢، عبداللطيف حمزة: الحركة الفكرية في مصر، ل١٠٤.

(٣) المواعظ والاعتبار، ج٢ / ل٤٢٧؛ حسن إبراهيم حسن: تاريخ الاسلام السياسي والثقافي والاجتماعي، ج٤ / ل٤٣٦ ، ٤٣٨ .

(٤) سعيد ديوەچی : تاريخ الموصل ، ج١ / ل٣٥٥ ؛ حسين امين: العراق في العصر السلجوقي، ل٢٣٩.

(٥) محمد كرد علي : خطط الشام ، ج٦ / ل١٤٠ ؛ رشيد الجميلي: دولة الاتابكة في الموصل، ل٣١٩.

(٦) العراق في العصر السلجوقي ، ل٢٤٠ ؛ تاريخ الموصل ، ج١ / ل٣٥٥ .

(٧) دولة الاتابكة في الموصل ، ل٣١٦ .

(٨) ابن منظور : لسان العرب ، ج٦ / ل٨٢ ؛ خطط ، ج٢ / ل ٢٩٢ - ٢٩٣ .

(٩) العراق في العصر السلجوقي ، ل ٢٤١ .

ناوی رەبات لەسەر فەرمودەی پێغەمبەر (د.خ) ناونراوە ، لەڕووی خـۆ خـاوێن کردنەوە لە ( گوناھ ) و " چاوەڕوانی نوێژ لەدوای نوێژ بەدانانی ڕاکێشان و بەسـتنەوە "[1] . لەکاتی بەتالی و بێ کاریاندا بایەخیان بەگوێگرتن دەدا لەوتاری پیاوچاکان ، کە بەخوولی ڕۆشنبیری دەچوو ئەویش بەدوو شێوە بوو وەك چـالاکی ومرزشـی جۆراوجـۆر لەوانە (ڕۆژوو نوێژکردن ، زیکرو چوونە ناو خەڵوەت )[2] ، تەنها لــە شـاری دیمەشـق ( بیست و سێ ) بنکە دروستکراوە[3]

یەکێك لەو بنکانە لەسەر خواستی شێرکۆ دروستکراو هەر بەناوی خۆیەوە نـاو نراوە رەبـاتی ( ئەسەدییە ) .کە دەکەوتە سەر ڕێگــای ( زرعـە ) لــە نزیـك ماڵەکـەی خۆیدا[4] . ( ابن جبیر ) یش باسیان لێ دەکات و دەڵێت : ئەو کەســانەی بەشـدار بــوون لەم کەمەن کێشییەدا ، وەك ( شاە ) لەم دنیایەدا دەژیان ، چونکە هەموو ژیانیــان لــە کەمەن کێشیدا بۆ خوا پەرستی تەرخان کردبوو لە پێناو وە دەست هێنــانی بەختـەوەری بەهەشتدا[5] .

---

(١) النويري : نهاية الارب ، ج٦ / ل١٩٩ .

(٢) رحلة ابن جبير ، ل٢٣١ .

(٣) محمد كرد علي : خطط الشام ، ج٦ / ل١٤٠ .

(٤) الاعلاق الخطيرة (تاريخ دمشق ) ، ج١ / ل ١٩٦ : الدارس في تاريخ المدارس ، ج٢ / ل١٩٤ .

(٥) رحلة ابن جبير ، ل ٢٣١ .

## د ـ میری حاجیان
( ٥٥٥ ك / ١١٦٠ ز )

حەج کردن : یەکێکە لە پێنج فەرزەکانی ئایینی ئیسلام ، پەروەردگار لەسەر موسوڵمانانی پێویست کردووە. بەم بۆنەیە موسوڵمانان ئاهەنگ دەگێڕن و لەسەر ڕێگاکانی کاروانی حەج دا چادرو خێوەت هەڵدەدراو لە ڕووی خۆراك و خواردنەوەو ئەزمەتکردنی حاجیەکان ژمارەیەك لەخەڵکیان بۆ دادەنان [١] . لەهەمووولایەکی خاکی ئیسلامدا ئەوانەی بەشداریان تێدا دەکرد، خۆی لەچەند هەزار کەسێك دەدا[٢]، پاش گرد بوونەوەیان دەوڵەت یەکێکی وەك لێپرسراوو ڕابەریان دەست نیشان دەکردو ناوی میری حاجیانی لێ دەنرا، میری حاجیان دەبوو خانەدان و ناودار بووایە، جا بەم بۆنەیەوە ئاهەنگی تایبەت ڕێك دەخرا، ( سوڵتان ) خۆی و هەموو ( دادومران ) و پیاوانی ( شەرع زان ) بەشداریان تێدا دەکرد، هەر لەم بۆنەیەدا میری حاجیان دەناسێنرا. گەلێك کار لە ئەستۆیدا بوو لەوانە سەرپەرشتی و هاوکاری کردن بەحاجیەکان لە دابینکردنی پێداویستیەکانیان و یارمەتی دانی لاوازەکان ، لەگەڵ دیاریکردنی بڕێك خەرجی بۆیان [٣] لەساڵی ( ٥٥٥ ك / ١١٦٠ ز )دا شێرکۆ لەدیمەشق دەست نیشانکرا بۆ ئەم پلەوپایەیە[٤]، باسی لێهاتوویی شێرکۆ دەکەن و دەڵێن : " ڕۆیشتنەکەی بەهەموو پێداویستیەکانەوە بوو لە خۆراك و پۆشاك و ژمارەی حاجیەکانی هەزار حاجی بووە، کە پێداویستییانی دابین کردووە " [٥] ، و ڕێگەی ڕۆیشتنیان لە ( تەیماو خەیبەر )ە وە بووە [٦] و زۆر بەسەر کەوتووانە کارەکانی بەئە نجام گەیاندووە بەشێوەیەك لەسەر زمانی هەمووان ، باسی چاکەو پیاوەتی کراوە[٧] . کاتێکیش گەڕاوەتەوە بۆ دیمەشق ، بەڕێزەوە سوڵتان نورەدین مەحمود خۆی بەرەو پیری ڕۆیشتووەو بەخێرهاتنەوەی کردووەو ئەو ڕۆژەش بەرز ئەرخێندراوە [٨] و لێرەدا دێڕێك هۆنراوەی ( عماد ) دەنوسین کە باس لەئاکاری جوانی دەکات بەرامبەر بە موسوڵمانان و دەڵێت :

فانت من زانت الايام سيرته وزاد فوق الذي جاءت به السير[٩].

---

(١) حسن ابراهم حسن: تاريخ الاسلام السياسي والثقافي، ج٤ / ل ٦٤٩ - ٦٥٠.
(٢) المنتظم ، ج٧ / ل٢٧٦ .
(٣) خطط ، ج١ / ل ٤٥٠ ؛ تاريخ الاسلام السياسي و الثقافي ، ج ٤ / ل ٦٥٠ .
(٤) تهذيب تاريخ دمشق الكبير ، ج٦ / ل٣٦٠ ؛ الكامل ، ج٧ / ل ١٥١ ، وفيات الاعيان ، ج٢ / ل٤٨١ ؛ كتاب السلوك ، ج١ / ل٤٠ ، شفاء القلوب ، ل٢٥ ، بەلام تەنها ( ئیبن ئەبی تەی دەڵێت : لە ساڵی ( ٥٥٦ ك / ١١٦١ ز ) دا شێرکۆ لە شامەوە چووە بۆ حەج . ) وەرگیراوە لە الروضتين ، ج١ / ل ١٢٤ .
(٥) الروضتين ، ج١ / ل١٢٤ .
(٦) وفيات الاعيان ، ج٢ / ل٤٨١ .
(٧) احمد بيلي : صلاح الدين ، ل٦٨ .
(٨) الروضتين ، ج١ / ل١٢٤ ، شاكر احمد بدر : الحروب الصليبية والاسرة الزنكية ، ل٣٠٤ .
(٩) له الروضتين ، ج١ / ل ١٤٥ وەرگیراوە .
( تۆ ئەو کەسەی کە ڕەوشتت ڕۆژگاری جوان و ڕازاوە کردووە
زیاتری هێناوە ئەو دەنگوباسەی کە ژیاننامەی کەسانی تر هێناویانە )

## بەشی چوارەم

# شێرکۆ و بنەماڵەی زەنگی

## یەکەم ـ پەیوەندیی شێرکۆ بە بنەماڵەی زەنگییەوە

١. لە ساڵی ( ٥٣٢ ـ ٥٤١ك / ١١٣٧ ـ ١١٤٦ز )

کاتێك عیمادەدین هەواڵی وەدەرنانی شێرکۆ براکەی و خێزانەکانیانی لە ( تکریت ) پێگەیشت ، کە زانیشی روویان کردۆتە موسڵ زۆر دڵخۆش بوو. فەرمانیدا زۆر بەرێزو شکۆوە پێشوازیان لێ بکرێت. پاشان بەرێزەوە بەخێرهاتنی کردن و میوانداریەکی شایستەی بۆ ساز کردن[١]. لە دەوروبەری ساڵی ( ٥٢٣ك / ١١٢٨ز ) ناوچەیەکی بەبایەخی لە شارەزوور پێدان [٢]، زۆری نەخایاند شێرکۆ چووە ریزی سووپاوە [٣] بەلێهاتووی و دڵسۆزی توانی پشتگیری خۆی لەحوکمی عیمادەدین زەنگیدا نیشان بدات، بەرامبەر بەمە زۆر لەبەرچاوی گەورەو مەزن بوو [٤]، کە بینیان بەسەرکەوتوویی و ئازایەتی تواناى رێکخستنی سوپاو سەرکەوتنی لەشەرەکاندا هەیە، زەویەکانی ( ئەلمۆزەر )ی درایە رۆژ لە دوای رۆژ پەیوەندی لەگەڵ نورەدین مەحمودی کوڕی عیمادەدین زەنگیدا بەهێزو پتەو تر دەبوو ، بە رادەیەك لەبەرچاوی زۆر لە پێشەوە بوو [٥] ، کارگەیشتە ئەوەی هەندێ جار نورەددین دەچووە نێو ریزی سەربازەکانی شێرکۆ وە [٦] چونکە شێرکۆ لە زۆربەی شەرەکاندا دژ بە خاچیەکان لە ولاتی شامدا بەشداری تیاکردووەو تیایانداو رۆلی لەبەرچاوی هەبووە [٧] ، ئەمە لەلایەك لەلایەکی ترەوە بەهوشیاری و هەڵسوکەوتی جوانی لەگەڵ ( جەمالەدین ) ئەصفەهانی وەزیردا توانی دۆستایەتیەکی بەهێز پێك بهێنێت و بوونە جێی بڕواو متمانەی یەکتر . لەم رووەوە ( جمالەدین ) دەورێکی باشی بینی لەنزیك کردنەوەی پێوەندی نێوان شێرکۆ لە عیمادەدین و بڵند کردنەوەی پلەی لە دەوڵەتدا[٨].

---

(١) تاریخ الباهر ، ل ٤٤ ؛ النوادر السلطانية ، ل ٦ ، الروضتين ،ج١ /ل ٢٠٠ ؛ تتمة المختصر في لخبار البشر ، ج٢ / ل ١١٧ ؛ شفاء القلوب ،ل ٢٣ ؛ شه ره فنامه ، ل ١٢٨ .

(٢) الروضتين ، ج١ / ل ١٢٩ ؛ النجوم الزاهرة ، ج ٦ / ل ٤ ؛ عمادالدين خليل : عماد الدين زنكى ، ل ٢٢٠ .

(٣) الروضتين ، ج١ / ل ١٢٩ ؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل ٨ ؛ خطط ، ج٣ / ل ٣٧٨ .

(٤) الروضتين ، ج ١ /ل ١٣٠ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٦ /ل ٤ ؛ تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل ٥٣ ؛ محمد امين زكي : مشاهير الكرد ، ج٢ / ل ٢٦٥ .

(٥) الكامل ، ج٧ / ل ٢٠٠ ؛ كتاب السلوك ،ج ١ / ل ٤٢ .

(٦) و فيات الاعيان ، ج١ / ل ١٤٢ ؛ عبدالعزيز سيد الاهل : صلاح الدين ، ل٣٧ .

(٧) الروضتين ،ج١ / ل٢١١؛ السيد الباز العريني : الشرق الادنى والايوبيون، ل ٢٥.

(٨) الروضتين ،ج ١ / ل٢١١ ؛ تاريخ ابن الفرات، مجلد ٤ / ج١ / ل ٥٢ .

پێوەندییەکە گەیشتە ئاستێکی وا کــە عیمــادەدین لــە ریــزی کوڕەکــەی خــۆی (نورەدین)ی دانابوو [1] ئەمەش ڕێگەی بۆ خۆش کــرد، بــۆ چوونــە پێشــەوە لــە کاروبــاری دەوڵەتدا بەجۆرێك، کە پلەی ( دیوانی زەنگی ) وەرگرت و بە سەرکەوتووی بەڕێوەی بــرد [2] بەمەیش زێتر ڕێگەی بۆ خۆش کــرد کــە لەبنەماڵــەی زەنگــی نزیــك ببێتــەوە و تەنانــەت شێرکۆش زۆربەی کات لەگەڵیاندا بوو.

ساڵی ( ٥٤١ ك / ١١٤٦ ز ) کە چوونە سەر قەڵای جەعبەرو گەمارۆیاندا، شێرکۆش لەم گەمارۆدانەدا لەگەڵیان بەشدار بوو [3] . عیمادەدین زەنگــی لــەکاتی گەمارۆدانەکــەدا شەهید کرا [4] ، دەستەڵاتی دەوڵەتی زەنگی لەنێوان کوڕەکانیدا دابەش بوو [5] .

---

(١) و فيات الاعيان ، ج ١/ ل١٤٢؛ عبدالعزيز سيد الاهل: صلاح الدين، ل ٣٧.

(٢) سيد على الحريرى : الاخبار السنية والحروب الصليبية ، ل ٨٧ .

(٣) الروضتــين ، ج١ /ل ٤٦ ؛ تــاريخ ابــن الفــرات ، مجلــد ٤ / ج ١ / ل ٥٣ ؛ ســعيد عاشــور : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل ٦١٠ .

(٤) الكــامل ، ج٧ / ل ٥٥ ؛ الروضتــين ، ج ١ /ل ٤٢ ، Zoeo Iden bourg. The crusaders p. 321 .

(٥) مراة الزمان ، ج ٨ / ق١ / ل ١٩١ ؛ العبر في خبر من غبر ، ج ٤ / ل ١١١

## رۆڵی شێرکۆ لە پشتگیری کردنی نورەدین

## لە فەرمانڕەوایی حەلەبدا ( ٥٤١ك / ١١٤٦ز )

سەردەمی پەیوەندی و یەکترناسین و پەیوەست بوونی ئەم دوزاتە دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگای عیمادە دین زەنگی باوکی ،کە هەردووکیان جێی متمانە و باوەری یەکتر بوون و سوودیان بە یەکتر دەگەیاند، نەك هەر ئەمیش بەڵکو جمو جوڵ و چالاکیەکانی سەربازی شێرکۆ ببونە مایەی سەرنج و تێروانینی نورەدین ، چونکە لەوە گەیشتبوو، کە سەر لەشکرەکانی تر کە نەفت و دەستەوەستان بوون لە بەجێهێنانیدا [١]. بەم هۆیەوە پەیوەندیان هێندە بەهێزو گرێ دراو بوو بەچەشنی دوو هاوڕێی دڵسۆز بەیەك رەفتاریان دەکرد، دوای کوژرانی عمادەدین ژمارەیەك لە سەرکردەکان خەریکی پلان دانان بوون بۆ دانانی ( سەیفەدین غازی ) بە سەرداری موسڵ [٢] .

لەم بارەیەوە ( ئیبن ئەبی تەی ) دەڵێت: " شێرکۆ بەخێرایی بۆ ئەم مەبەستە رووی کردە چادرەکەی نورەدین و ئاماژەی بەوە کرد ( کە پێیان ووتوم لەگەڵیاندا برۆم بۆ موسڵ بەلام نەمتوانی بەجێت بهێڵم و بەباشی دەزانم، کە برۆی بۆ حەلەب، تاکو کورسی پادشای ئەم شارە بۆ تۆ بێت " ) .ئەوکاتەش هەموو سەربازەکانی شام لە خزمەتی تۆدا دەبن جگە لەوە: " من دەزانم، کە دوارۆژیش هەر بۆ تۆ دەبێت، چونکە وڵاتی شام هەموو پەیوەندی بەشاری حەلەبەوەیەو دەرکەوتویشە بەسەر رۆژهەڵاتدا" [٣].

نورەدین مەحمود گوێڕایەڵی قسەکانی شێرکۆ بووە ،چونکە سەرباری دڵسۆزیەکەشی ئەوەی لەبەرچاوو بووە، کە لەلای باوکی، تەنانەت لەناو سەربازەکانیشدا پلەوپایەیەکی بەرزی هەبووە [٤] ، هەر سەبارەت بەم هۆیە بوو ،بەخێرایی هەستاو ( موستیلەکەی ) لە پەنجەی باوکی دەرهێنا ، کە هێماو نیشانەی پادشایی بوو کردیە پەنجەی خۆی [٥] و شێرکۆ بانگی سولتانی بۆ دا [٦] ، لەهەمان کاتدا چەندین کەس لە پیاوە ناسراو ماقولەکانی شاری حەلەب شان بەشان یان وەستان ، بەم جۆرە سەرەتای کارەکەیان بە ئەنجام گەیشت و تیایدا سەرکەوتن [٧] .

شێرکۆ فەرمانی دا بەکۆبوونەوەی سەر لەشکرو سەربازەکانی شام بۆ خزمەتی نورەدین مەحمودو لە ساڵی ( ٥٤١ ك / ١١٤٦ ز ) گەیشتە شاری حەلەب ، شێرکۆ بەخێرایی خۆی گەیاندە لای قەلاکەو بانگی حاکمی قەلاکەی کرد، وەك رێزگرتن و پێشوازی

لیکردنی سوڵتانی نوێ ، دواى هاتنی حاکمی قەلاکە نورەدین مەحمود سەرکەوتە سەر
هەلاکە و چووە ناوی و بەمەش تێگەیشت،کە شێرکۆ هۆکارێکی بەهێز بوو لە پشتگیری
لر دنی دابۆ سەر کورسی دەسەلات لە شاری حەلەب [٨]

---

(١) الكامل ، ج٧ / ل٢٠٠ ؛ الروضتين، ج١ / ل٢١١؛ البداية والنهاية، ج ١٢ / ل ٢٥٩ ؛ السيدالباز العرينى : الحروب الصليبية ، ج١ / ل ٦٦٧ .

(٢) الروضتين ، ج ١ / ل ٤٦ ـ ٤٧ ؛ تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل ٥٣ ؛ اتعاظ الحنفا ، ج٣ / ل ١٨١ .

(٣) له الروضتين ، ج١ / ل ٤٦ ـ ٤٧ وه ركيراوه .

(٤) الروضتين ، ج١ / ل ٤٧ ـ ٤٨ ؛ مفرج الكروب ، ج ١ / ل ١٠٧ ـ ١٠٨ ؛ تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل ٥٣ .

(٥) الكامل ، ج٧ / ل ٥٧ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل ٢٨٢ ؛ المختصر في اخبار البشر ، ج٢ / ل ١٩ ؛ كامل الغزي : نهر الذهب في تاريخ حلب ، ج٣ / ل ٦٠ .

(٦) الروضتين ، ج ١ / ل ٤٧ ـ ٤٨ ؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل ١١٧ ـ ١١٨ ؛ تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل ٥٣ ؛ رانسيمان : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل ٣٨٦ .

(٧) عماد الدين الاصفهاني : دولة ال سلجوق ، اختصار : البنداري ، ل ١٩٠ ؛ و فيات الاعيان ، ج١ / ل ١٥٨ ؛ العبر في خبر من غبر ، ج ٤ / ل ١١١ .

(٨) الروضتين ، ج ١ / ل ٤٨ ؛ مراة الجنان ، ج ٣ / ل ٢٧٤ ؛ اتعاظ الحنفا ، ج٣ / ل ٣٠٦ .

بێگومان ئەگەر دڵسۆزی و لێهاتووی شێرکۆ نەبوایە لەگەڵ سەرلەشکرو سەربازەکانی شامدا ئەوا جڵەوی کاروبار شیرازەی دەبچڕاو ناوچەکە بەرەو شپرزەیی و لێک پچڕان و پارچەبوون دەڕۆیشت ، چونکە هەر میرو دەستەڵاتدارێک جڵەوی بەلای خۆیدا کێش دەکرد، بەمەیش ئاژاوە دەکەوتە ناوچەکەوە [1] .

ئەم هەڵوێست و ڕەفتارە شێرکۆی هێندەی تر خستە نێو دڵی نورەدین مەحمودەوە کە بەوپەڕی بڕواوە پشتی پێ ببەستێت، دواتر شێرکۆ کەوتە قایمکردنی دەستەڵاتی نوێ لەناوخۆداو سەرباری ئەمەیش هەر شێرکۆ خاوەنی چاکەیە لە ڕزگارکردنی ئەم دەوڵەتداو پارێزگاری کردنی لە هێرش و پەلاماردانی خاچیەکان، کە لەساڵی ( ٥٤١ ك / ١١٤٦ز) بە سەرکردایەتی میری ( ئەنتاکیە ) هاتبوون . ئەو دەمە( حەوت ) ڕۆژ بوو نورەدین ببوە دەسەڵاتداری حەلەب کە شێرکۆ لەشکری خاچیەکانی بەزاندو بە سەرکەوتوویی گەڕایەوە بۆ حەلەب [2].

سوڵتان نورەدین دوای جێگیربوونی دەسەڵاتی هەوڵی دا ، شێرکۆ لەخۆی نزیک بکاتەوە بەشێوازێك، کە مێژوو نووسەکان دەڵێن : "بە هەردوو دەست گرتبووی بە خۆیەوە و هەڵی کێشا لەخەڵاتی خۆی ،کە پێی بەخشیبوو" [3]، سەرەڕای ئەوەیش کردیە پێشەوای لەشکرەکەی خۆی [4] و لەهەموو میرەکانی تر باڵادەستتر بوون [5] ، بەرادەیەك کەلە حەلەب دا ، وەك جێگری نورەدین مەحمود سەیر دەکرا [6] .

شاوریش کە هات بۆ شام لەهەمان ڕوانگەوە پێشنیاری کرد ،کە شێرکۆ وەك جێگری نورەدین لە میسر بێت [7] . لەلایەکی ترەوە سوڵتان نورەدین بە پەرۆشی غەزا کردن دژی خاچیەکان چەندین جار لەگەڵیان دا جەنگاوە ،مێژوو نووسەکان لەم بارەیەوە لەوە دەدوێن، کە شێرکۆ لەم هێرشانەدا بەشداری کردووە ، ( ئیبن فورات ) دەڵێت : " شەڕ نەبووە سوڵتان نورەدین ئەنجامی دابێ و شێرکۆیش وەك میری سوپایان و وەك سەر دارێك لەگەڵیدا نە بووبێت و بەشداری نەکردبێ " دیارە شێرکۆ لەم شەڕو ڕووداوانەدا هەمیشە ناوو شۆرەتی هەبووە [8] .

---

(١) الروضتين ، ج١ / ل ٤٧ ـ ٤٨ ؛ مه حمود السرطاوي: تاريخ الايوبيون ، ل ٤٨ .

(٢) الروضتين ، ج١ / ل ٤٨ ، ١٢٤ ؛ Stevenson .The crusaders in the east .P. 156 .

(٣) تاريخ ابن الفرات ، مجلد٤ / ج١ / ل٥٣ ؛ ( بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە میرنشینە سەربازییەکان ) .

(٤) الروضتين، ج١ / ل١٣٠؛ تتمة المختصر في اخبارالبشر، ج٢ /ل ١١٧ ؛ شفاء القلوب، ل٢٤؛ مختصر في تاريخ الدول ، ل ٢١٣ .

(٥) تاريخ الباهر ، ل ١٦٨ ؛ الروضتين ، ج ١ / ل ٨ ؛ مفرج الكروب ، ج ١ / ل ١٠ .

(٦) العبر في خبر من غبر ، ج ٤ / ل ١٨٠ ؛ اتعاظ الحنفا ، ج ٣ / ل ٢٦٩ .

(٧) تاريخ الباهر ، ١٣٩؛ زبدة الحلب، ج٢/ ل٢١٦ ـ ٢١٧؛ شفاء القلوب، ل٣٤؛ حسن المحاظرة ، ج ٢/ ل٢٠، ( بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە بەندی دووەم .. یەکەم هەڵمەتی سەربازی / لا پەڕە ( ٩٠ ) .

(٨) تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج ١ / ل ٥٣ .

## ٢. دانانی شێرکۆ بە جێگری ( نورەدین )
## لە دیمشق ( ٥٥٢ ك / ١١٥٧ ز )

دوای گەڕانەوەی نورەدین مەحمود بە دوو مانگ لە ساڵی ( ٥٥٢ ك / ١١٥٧ز ) لە شەڕی ( بانیاس ) ، چەند رۆژێکی مانگی رەمەزان رۆیشتبوو، کە نیشانەی نەخۆشی لەسەر رووی دەرکەوت، و رۆژ لە دوای رۆژ تا دەهات نەخۆشیەکەی قورستر دەبوو ، گەیشتە ئەو رادەیەی مەترسی لە ژیانی خۆی پەیداکرد ، ناردی بەدوای براکەیدا ( نەصرەدین میری میران ) لەگەڵ پێشەوای لەشکرەکەی شێرکۆو بەئامادەبوونی گشت میرە گەورەکانی و پێشەوا لەکۆبوونەوەیکدا رای سپاردن سەبارەت بەو بۆچوونەی خۆی، کە بە پێویستی نەزانی جێبەجێ بکرێت، ئەویش ئەوە بوو کە لەدوای خۆی براکەی بخرێتە شوێنی و ئەمەیش بەهۆی ناوبانگ و ئازایەتیو شوێنی مانەوەیشی لە شاری حەلەب دەبێت.

هەروەها دانانی شێرکۆ بەفەرمان رەوایی شاری دیمەشق و ئەو ناوچانەی سەربەون بەشێوەی جێگری، ( نەصرەدین ) و بەشداربووان بڕیاریان لەسەرداو سوێندیان خوارد کە پەیرەوی راسپاردەکەی بکەن ، بەڵام نەخۆشیەکەی زۆری بۆ هێناو داوای کرد بیبەنەوە بۆ ناو قەڵاکەی حەلەب تاکو لەوێ بمێنێتەوە لە پاشدا شێرکۆ رووی کردە شاری دیمەشق تاکو لەگەندەڵی ناوخۆو خاچیەکان بیپارێزێ. نەصرەدین میری میران لەگەڵ هاورێکانیدا رووەو قەڵاکەی حەلەب چوون ، بەڵام فەرمانڕەوایی قەڵاکە لەروویاندا وەستاو دەرگای قەڵاکەی لێ داخستن تاکو نەصرەدین و هاورێکانی ناچاربوون بیشکێنن و بچنە ژوورەوە، ئاژاوە سەری هەڵدا بەتایبەتی لەناو شەقامەکانی حەلەبداو بەردەوامیش بوو تاکو مانگی شەوالی ئەو ساڵە، باری تەندورستی نورەدین هەرباش نەبوو ،کە ئەمەیش بوە مایەی نیگەرانی و دڵگرانی موسڵمانان و پشێوی کارەکانیان [١] سەرباری ئەمەیش خاچیەکان هێرشیان هێنایە سەر ( شیزر ) [٢] و کەوتنە کوشتن و تاڵانکردنی دانیشتوانەکەی [٣]

---

(١) ذیل تاریخ دیمشق ، ل ٣٤٩ ـ ٣٥٠ ؛ كنز الدرر ، ج٦ / ل ٥٦٩ : الكواكب الدرية في السيرة النورية ، ل ١٥٣ ؛ رانسیمان : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل ٥٥٤ ـ ٥٥٥ .

(٢) الشیزر : قەڵایەکە لەگەل (کورە) یەك لە شام نزیك مەعرە. (معجم البلدان ، ج ٣ / ل٣٨٢ )

(٣) الروضتين ، ج ١ /ل ١٠٩ ، . Zoeo olden bourg . the crusaders . P. 353 .

بەڵام زۆری نەبرد دەنگ و باسی و مژدەی چاك بوونەوەی نوردیـن مـەحمود بـڵاو بۆوە ، بەمەیش خۆشی کەوتە سەر رووی خەڵکی و دوای تەواو چاك بوونەوەی دەستی کـرد بەناردنی نوسراو بۆ پێشەواو سەر لە شکرەکانی بـۆ دەست پـێ کردنـەوەی غـەزاکردن ، شێرکۆ بەبیستنی مژدەی چاك بوونەوەی نورەدیـن و خـۆ ئامـادەکردنی بـۆ غـەزا کـردن، بەخێرایی هەستاو لەگەڵ سوارەکانی خۆی کۆکردەوەو لە دیمشقەوە بەرەو شـاری حەلـەب کەوتە رێ .

بەگەیشتنی شێرکۆ بۆ حەلەب نورەدیـن مـەحمود زۆر ریـزی لێگـرت و سوپاسـی هەوڵ و کۆششی کرد، کە بەدڵسۆزی و سەرکەوتویی کارەکانی خۆی بەرێوەبردووەو ، پاشـان لە پێناوی پاراستنی وڵات و دوورخستنەوەی بەلای دوژمنان دا پێکەوە کۆبوونەوەو بڕیـاری گونجاویان دا .[1]

سەبارەت بە هـەڵوێستی شێرکۆ بەرانبەر بەنورەدین باشترین شـایەت و بەڵگـە ئەو پارچە هۆنراوەیەیە، کە نورەدین بۆ شێرکۆی ووتوە[2] .

لقد حسنت صفاتك يازماني — و فزت بمارجوت من الأمان
فكم اصبحت مرعوبا مخوفا — فبدلت المخـــافة بالأمان
فروعت القلوب من البرايا — و صار شجاعها مثل الجبان
فولى الخوف مهدوم الحسباني — وعـــاد الامن معمور المغاني

---

(١) ذيل تاريخ دمشق ، ل ٣٥٠ .
(٢) الروضتين ، ج ١ / ل ١٠٩ ،

(هاورێم بەراستی رەوشتەکانت جوان بوون بەو هیوایەش گەیشتم کە ئاواتە خوازی بووم
زۆر جار ژیانم بریتی بوو لە ترس و دڵە راوکێ بەڵام ئێستا ئەو ترس و سامە رەویوینەتەوە
تێکرا دڵانی خەڵکی ترس دای گرتن — ئازاکانیش چونە ریزە ترسنۆکەکانەوە
تـــرس پشتی هەڵکردو هەڵهـــات — ئینجـــا ئارامی و دڵنیایی گەڕایەوە )

## ٤ ـ شێرکۆو پـاراستنی ئارامی له شام

( ٥٥٤ ك / ١١٥٩ز )

له سەرەتای رۆژانـــی مـانگی ذی الحجـەی سـاڵی ( ٥٥٤ك / ١١٥٩ ز ) دا نورەدیـن مەحمود له قەڵای حەلەب نەخۆشی رووی تێکردەوە، ئه مجارەش وەك جاری پێشـــوو لاوازی کردبوو، کاریگەری پێوە دیار بوو، که بەجۆرێك هێنابوویه ســەرلێواری مـردن و ترسـی لا پەیدا کردبوو، سەبارەت بەوەی کە لەدوای خۆی کێ جڵەوی فەرمانڕەوایی دەکەوێتە دەسـت ، ئایا کەسێکی خاوەن ویژان دێتە شوێنی ؟ دیارە لەم لێکدانەوەیەدا زۆری بۆهــات و داوای کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ هاورێکانیدا کــردوو پـێی ووتـن : گوێـم لێ بگـرن مـن بـەچاوی بەزەییەوە دەڕوانمە دەست و پێوەندو گشت موســوڵمانان و بـیر لـەوە دەکەمـەوە ، کەلـە شوێنی من والییەکی زۆرداروو نـەزان دانەنیشـێت، بـۆ نموونـە نـەصرەدینی بـرام ، خـۆم شارەزایی رەوشتی ئەوم و بەدڵم نیە، دەڵێم : شایستەی ئەوە نیە هیچ کارێکی موســڵمانانی لە دەستا بێت، بۆیە من بەباشی ئەزانم ،کە تاکە هەڵبژاردەمان بۆ ئـەم شـوێنە براکـەی ترم ( قوتبەدین مەودوود ) بێت فەرمانڕەوایی موسڵ ، پیاوێکی ئازاو ژیرو رەوشــت جـوان ، هەڵگری بـیرو بـاوەڕی ئـایینی ئیسـلامە، بۆیـە حەزدەکـەم پەسـەندی بکـەن و لەگـەڵ کارەکانیدا بن و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن، ئەوانیش بەخواستێکی پاکەوە سوێندیـــان بۆ خوارد داواکەی بەجێ بهێنن .

دەستبەجێ نورەدین نوێنەری خۆی ناردە موسڵ بۆ لای ( قوتبەدین )ی برای بۆ ئەم مەبەستەو بۆ خۆ ئامادەکردنی بۆ کاری نوێ لە حەلەب ، حاکمی موسڵ بەخێرایی بـەخۆیی و سوارەکانییەوە بەرەو شام کەوتە رێ [1] .

ناصرەدین لەناو شاری حەلەبدا کەوتبووە پیلانگێران دژی نورەدین مەحمودی بـرای و خەڵکی لەخۆی کۆکردبوەو گەمارۆی قەڵای حەلەبی دابوو، لەوکاتەدا شـێرکۆی دڵسـۆزی سوڵتان نورەدین لە حمص بوو، گوێ بیستی مردنی نورەدین مەحمود بوو ، بەخێرایی خـۆی گەیاندە شاری دیمەشق بۆ لای ( ئەیوب ) ی برای، تـاکو پشـێوی و نائـارامی روو نـەدات . بەڵام بەگەیشتنی ( ئەیوب ) داوای لێکرد کە بگەڕێتەوە بـۆ شـاری حەلـەب وتـی : ئەگـەر نورەدین لە ژیاندا مابوو ئەوا لەکاتی خۆیدا خزمەتی ئەکەین، ئەگەر کۆچی دوای کردبـوو من لێرەم چیت دەوێ بیکە؟[2] . شێرکۆ بەزووی خۆی گـەیاندە شـاری حەلـەب و سـەرکەوتە نـاو قەڵاکەو بەبینینی نورەدین بەیەك شـاد بوونـەوەو بـەخێرایی لـە بەرزاییەکـەوە

نورەدینی نیشانی خەڵکەکەدا کە تــا لــەخوارەوە ببیینــن و نــەو درۆیــە بڕەوێتــەوە، کــە ناحەزان دروستیان کردبوو، گوایە نورەدین مەحمود مردووە، لەلایەکی ترەوە بــەم کــارەی شێرکۆ، پیلانەکەی میری میران ســەرنەکەوت ،کــە خــەڵکی لــە دەوری خــۆی کۆکردبــۆوە، خەڵکیش نوردین موحمودیان بەچاوی خۆیان بینی، دیارە بەم کــارەیش شــێرکۆ دڵســۆزی و پشتگیری خۆی بۆ دەستەڵاتی ســوڵتان نورەدیــن مــەحمود نــوێ کــردەوەو مــیری مــیرانیش ناچاربوو ، بگەڕێتەوە بۆ شاری ( حران )[٣] .

---

(١) ذيل تاريخ دمشق ، ل ٣٥٥ ؛ الكامل ، ج٧ / ل ١٤٤ ؛ زبدة الحلب ، ج ٢ /ل ٣٠٨ ـ ٣٠٩ ؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل ١٣٠ ؛ سعيد ديوەچى: تاريخ الموصلَ ، ج١ / ل ٢٨٩ـ ٢٩٠ .

(٢) الكامل ،ج٧ / ل ١٤٤ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل ٣٠٩ ؛ كنذ الدرر ، ج ٦ / ل ٥٦٩ ـ ٥٧٠ ؛ المختصر في اخبار البشر ، ج ٣ / ل ٣٥ .

(٣) الكامل ، ج٧ / ل ١٤٤ ؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل ١٣٠ ؛ تتمة المختصر في اخبار البشر ، ج٢ / ل ٩٥ ؛ العبر في ديوان المبتدا والخبر ، ج ٥ / ل ٢٤٣.

لەلایەکی دیکەوە میری میران هاوکارو هاندەری (شیعەکان) بوو دژی (سوننەکان) بەزیادکردنی چەند وشەیەك لەکاتی بانگداندا وەك (حی علی خیر العمل محمد و علی خیر البشر) بەمەیش ئاژاوە لەنێوان موسوڵمانانی سوننەوشیعەدا دروست بوو، شیعەکان کەوتنە تالانکردنی خوێندنگای (ئیبن عصرون) و بازاڕو مزگەوتیان سوتاند [1].

شایانی باسە بەگەیشتنی شێرکۆ ئارامی گەڕایەوە بۆ ناو شاری حەلەب و شێرکۆ لای نورەدین مەحمود مایەوە، بەلام بەرێکەوت پیلانێکی تر ئاشکرابوو، کە دژ بە نورەدین مەحمود ئەنجام درابوو، پیلانەکەی بریتی بوو لەوەی کە هەندێ لە کاربەدەستانی دەوڵەت لە شاری دیمەشق بە نەهێنی نامەی تایبەتیان بۆ میری میران نووسی بوو، تا بهێت بۆ دیمەشق و دەسەلاتی شاری بدەنە دەست، هەر لەم کاتەیشدا نوسراوێك لەلایەن حاکمی قەلای (جەعبەر)ەوە ئاراستەی نورەدین کرابوو، کە ئاماژە بۆ رۆیشتنی میری میران دەکات بۆ دیمەشق، سوڵتان نورەدین دەستبەجێ داوای لە شێرکۆ کرد، دەوری خۆی لەم کارەشدا ببینێت و نەهێلێت بگاتە دیمشەق. شێرکۆش بەخۆی و سوارەکانیەوە بەرەو رووی بۆوەو رێی لێگرت، میری میران بەبیستنی چاکبوونەوەی نورەدینی برای، گەڕایەوە شوێنی خۆی لە حەران، پاشان شێرکۆش گەڕایەوە.

دوای چاکبوونەوەی نورەدین بە لەشکرێکەوە رووی کردە شاری حەران بەلام براکەی لەوێ هەڵهات، نورەدین شارەکەی دایە (زەین الدین علی کچك) کە جێگری قوتبەدینی برای بوو لە موسڵ، لەدوایدا نورەدین مەحمود و میرەگەورەکانی دەوڵەت روویان کردە شاری دیمەشق بۆ پێشوازی لەمیوانەکانی موسڵ. بەلام قوتبەدین جمالەدینی وەزیری نارد بۆ دیمەشق بۆ زانینی بارودۆخی ئەوێ لە (٨)ی سەفەری سالی (٥٥٤ ك / ١١٥٩ ز) گەیشتە شاری دیمەشق و زۆر رێزی لێ گیراو میوانداریێکی باش کرا، نورەدن لە پاداشتی ئەمکارە جوانەی کە قوتبەدین ئەنجامی داو شێرکۆی وەك (بالوێز) دەست نیشان کرد لەگەڵ جەمالەدین وەزیر بگەڕێتەوە بۆ موسڵ و سوپاس و پێزانینی خۆیانی پێ بگەیەنێت بە براکەی، رۆژی شەممە رێکەوتی (١٥) ی سەفەری ئەوسالە کەوتنە رێ بۆ موسڵ. پاش ئەوە نورەدین کەوتەوە رێکخستنی کارەکان بۆ خۆبەهێز کردنەوە لە ناوخۆدا، لەگەڵ شیعەکان پێك هاتەوە، نورەدین مەحمود هەوڵ و تەقەللای شێرکۆی بەنوێکردنەوە ئایندەی خێزانەکەیان دەزانی و کە لەدواییدا بووە بەیتی ئەیوبی، چونکە هەمیشە هەڵوێستی شێرکۆی لەبەرچاوو بوو، کە چۆن لە دیمەشقەوە خۆی گەیاندە شاری حەلەب او خزمەت کردنی نوردەین و جێگیر کردنەوەی دەستەلاتەکەی لە شام دا [2].

---

(١) زبدة الحلب، ج ٢ / ل ٣٠٨ ـ ٣١٠.

(٢) ذيل تاريخ دمشق، ل ٣٥٦ ؛ الكامل، ج٧ / ل ١٤٤ ؛ مراة الزمان، ج ٨ / ق ١ /ل ٢٤٦ ؛ الروضتين، ج١/ ل١٢٢-١٢٣؛ مفرج الكروب، ج١/ ل١٣١؛ رشيد الجميلي: دولة اتابكة في الموصل، ل٨٦ ـ ٨٧.

## دووەم ـ رۆڵی شێرکۆ لەیەك پارچەیی خاکی شام دا .

## پەیوەندیی سیاسی نیوان حەلەب و دیمەشق

( ٥٤١ ـ ٥٤٦ك / ١١٤٦ ـ ١١٥١ز ) :

سوڵتان نورەدیـــن مـەحمود هەرلــە دەسـتبەکار بوونیـەوە، وەك فـەرمانڕەوایی حەلەب بیری لەیەکپارچەی خاکی شام کردەوە، چونکە شـاری دیمەشـق شـوێنێکی گرنگـی هەبوو لەسەر رێگەی بازرگانی لــەنێوان حەلـەب و قاهـیرەدا. بایـەخی زیـاتر بــوو بـۆ موسڵمانان، لەبەر ئەوەی لە رووی سەربازییەوە لــە ناوەڕاسـتی شـامدایە، ئەگـەر دەسـت دوژمن بکەویت هەرەشە لەحەلەب دەکات و بە پێچەوانەوە بکەوێتە دەست موسـڵمانان ئـەوا میرنشینیەکانی خاچیەکان لاواز دەبن و مەترسیان لەسەر ناوچەکە کەم دەبێت.

لەلایـەکی تــرەوە مانەوەیشـی لەژێردەسـتی فـەرمانڕەوایانی هاوپـــە یمانی خاچیەکان کۆسپ بوو لەرێگــەی یـەکێتی شـام و پیـادەکردنی نەخشـەی خاچیـەکان لــە ناوچەکەدا [1]. بەڵام نورەدین بەزیرەکی خۆیی و هاورێ نزیکــەکانی سیاسـەتێکی نــەرم و لەسەرخۆیان پیادەئەکرد لە دروستکردنی ئــەم یەکێتیـەدا بۆیــە سـەرەتا هاورێیـەتیان دروستکرد لەگەڵ فـەرمانڕەوایی دیمشـقدا ( معـین الدیـن أنـر ) [2]. بەمـەش لەسـەردەمی نورەدیندا قۆنـاغیکی تردەسـتی پیکـرد لـەنێوانیان لـەکاتێکدا هـەردوولا ئامـادەبوون روداوەکانی رابردوو بخەنەلاوەو لاپەڕەیەکی نوی هەڵبدەنــەوە بــۆ دروسـتکردنی متمانــە لەگەڵ یەکتر [3].

پاشان نورەدین هەنگاوی زیاتر نا بۆ ئاشتی و کچی ( أنــر )ی خواسـت ، لەگـەڵ ئەوەشدا ( أنر ) هێشتا هاوپــە یمانی خاچیـەکان بــوو، بــەڵام نورەدیـن و میرەگـەورەکان دەیانویست لەسەرخۆ لە خاچیەکانی دووربخەنەوە بۆ نموونــە، کـە ( تونتـــاش حــاکمی بصری و صرفد ) هەڵگەڕایەوە لە دەستەڵاتی دیمەشق ، لەشکری حەلەب چــوون بــەهانای ئانــەرەوە سـاڵی ( ٥٤٢ك / ١١٤٧ ز ) چونکـە تونتــاش ئەیویسـت ناوچەکـە بداتــە دەسـت خاچیەکان، بەم کارەش ساردی کەوتە نێوان معیددین ئانرو خاچیەکان [4]

-----

(١) مراة الزمان ج ٨/ ق١/ ٢٢٠ـ٢٢١؛ ارنست باركر : الحروب الصليبية ، ل١٥٦، محمودياسين التكريتي: الايوبيون في شمال الشام والجزيرة ، ل ٥٣ .

(٢) مفرج الكروب، ج١/ ل١٢٦؛ البداية والنهاية ، ج١٢/ ل٢٢٢؛ العبر في ديوان المبتدا والخبر، ج٥/ ل١٦٥
Stevenson .The crusaders p. 156.
ئونر : یەکێك بووە لەمیرەکانی دیمەشق، پیاوێکی رەوشت جوان وخێرخواز بووەو زانستخوازیشی خۆش ویستوەو خوێندنگـای معینیـەی دروسـتکردووە لـە دیمەشق، لەسـاڵی (٥٤٤ ك / ١١٤٩ ز ) کۆچـی دوایـی کردووە . ( شذرات ، ج ٤/ ل ١٣٨ )

(٣) ئەم کارەی نورەدین مەحمودیش بەناردنەوەی جارییەکی (موعینە دین ئونر) کەلای باوکی بوو لەدوای گرتنی بەعلەبەك ساڵی (٥٣٤ ك/ ١١٣٩ز)سەرە تایەکی باش دەستی پێکرد، (مفرج الكروب ،ج١/ ل٨٦) لەپاداشتی ئەمکارەدا ئونر بکوژەکەی زەنگی دایەوە دەست نورەدین (ذيل تاريخ دمشق، ل٢٨٥).

(٤) ذيل تاريخ دمشق . ل ٢٨٩ ؛ ارنست باركر : الحروب الصليبية ، ل ٧٣ .
Stevenson .The crusaders in the east. P. 158.

هەروەها نورەدین یەکێك بوو لەو میرانە، کە ساڵی (٥٤٣ك / ١١٤٨) بۆ بەرگری لە دیمشق لە بەرپەچدانەوەی هێرشی دووەمی خاچییەکان [١]، و بەم هەنگاوانە توانی کەمێك هاوپەیمانی نێوان حاکمی دیمەشق و خاچییەکان لاواز بکات، بۆ زیاتر دور خستنەوەی (موعینەدین ئانر) لە دوژمنان ساڵی (٥٤٤ ك / ١١٤٩) نورەدین داوای یارمەتی لێ کرد، بۆ بەرگری لە شاری حەلەب ئەمیش سەرلەشکر (بەزان کوڕی مامین) ی نارد، کە میری ئەنتاکیەی تیا کوژرا [٢].

هەر لەم ساڵەدا (٥٤٤ك / ١١٤٩ز) موعینەدین ئانەر کۆچی دوایی کردو (مجیرە دین) بوو بە فەرمانڕەوای دیمەشق.

نورەدین بە وریاییەوە سەیری داهاتووی دیمەشقی دەکردو لێی دەترسا [٣]، کاتەکەیشی زۆر لەباربوو، کە دیمەشق بگرێت بەڵام مردنی سەیفەدینی برای، کە فەرمانڕەوایی موسڵ بوو سەرقاڵی کردبوو نەیهێشت ئەوکارە ئەنجام بدات [٤].

خاچیەکان لەم کاتەدا کەوتنە ئازاردانی دانیشتوانی حۆران نزیك دیمەشق و تاڵانیان کردن و دانیشتوانەکانی پەنایان بۆ حەلەب برد، کە بەهانایانەوە بێن. ساڵی (٥٤٤ ك / ١١٤٩ز) نورەدین لەگەڵ سەرلەشکرەکانی کە شێرکۆ پێشەوا بوو، هاتن بۆ دیمەشق و نامەیەکیان ئاراستەی مجیرەدین کرد بۆ دڵنیاکردنی، چونکە نەهاتوون بۆ شەڕ کردن لەگەڵیانداو داواشیان کرد ئەو یارمەتییە ببڕن، کە ئەیدەنە خاچیەکان لە دیمەشقەوە، لەگەڵ ناردنی سەرباز وەك یارمەتییەك دژی خاچییەکان، مجیرەدین نامەکەی لا پەسەند نەبوو قبوڵی نەکرد بۆیە سوڵتان نورەدین ئەمجارەیش ویستی هێرش بکاتە سەریان، بەڵام باران نەیهێشت. تا لەساڵی (٥٤٥ك / ١١٥٠ز) دا هەردوولا رێکەوتن و لەم کارەشدا شێرکۆ رۆڵی گەورەی هەبوو، چونکە ئەجمەدین ئەیوبیی برای سەرلەشکر بوو، بڕیار درا ناوی نورەدین دوای خەلیفەو سوڵتانی سەلجوقی لەخوتبە بخوێنرێتەوەو ناوی لەسەر پارە بنوسرێت. پاشان نورەدین و لەشکرەکەی گەڕانەوە بۆ حەلەب [٥]، بەم ریکەوتنەش دیمشق کەوتە ناو راسپاردەی نورەدینەوە.

لەساڵی (٥٤٦ك/ ١١٥١) دا هودنەی نێوان دیمەشق و خاچیەکان کۆتایی پێ هات و نورەدین و میرەگەورەکان بەووردی چاودێری بارودۆخەکەیان دەکرد، لەوە دەترسان کە هاوپەیمانیەکە لەنیوان دیمەشق و خاچییەکان نوێ بکرێتەوە، بۆیە نورەدین و میرە گەورەکان بڕیاریاندا ئەگەر بەهێزیش بووە رێ نەدەن، بۆیە نورەدین و شێرکۆ بە لەشکرەوە گەیشتنە بەردەمی دیمەشق و سەربازگەیان لەسەر زەویەکانی (عەزرا) لێدا.

---

(١) الكامل، ج٧/ ل٦٨، . Stevnson .The crusaders in the east P. 160

(٢) ذيل تاريخ دمشق، ل ٣٠٤؛ البدية والنهاية، ج ١٢/ ل٢٢٥؛ Zoeolden bourg the crusaders .P. 347

(٣) عيون التواريخ ، ج ١٢ /ل ٤٣١ .

(٤) تاريخ الباهر ، ل ٩٣ ؛ مراة الزمان ، ج ٨ / ق١ / ل ٢٠٤ ؛ مفرج الكروب ، ج١/ ل ١١٦ ؛ رانسيمان : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل ٥٤١ ؛
Gibb : Damascus chronicle of crusaders . P. 225 – 226 .

(٥) ذيل تاريخ دمشق ، ل ٣٠٨ ، ٣١٠ ؛ الروضتين ، ج١ / ل ٧٠ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل ٢٩٨ ؛ البداية والنهاية ، ج١٢ / ل ٢٢٨ ؛
Stevenson. The crusaders . P. 166 – 169 .

سەرەتا داوای هاوکاریان لە مجیرەدین بە سوپا دژی خاچیەکان کرد ، چونکە نورەدین لەگەڵ دەستەلاتی میسر رێك کەوتبوو بە هێزی دەریاییەوە هێرش بکەنە سەر لەناراوەکانی شام ، ئەمانیش لێدانی کوشندە ئاراستەی خاچیەکان بکەن . هێزی دەریایی گەیشت و هاتە سەر شاری عەککاو پاشان ڕووەو صەیدا هاتن، بەلام مجیرەدین هەر لەسەر لەللە ڕەقی خۆی جەختی دەکرد، تا نورەدین مەحمود بە ناچاری بڕیاریدا دیمەشق بگرێت ، هەرچەندە حەزی بە خوێن ڕشتن نەدەکرد[1]

بۆیە نوێنەری بۆ لای موجیرەدین نارد بۆ وریا کردنەوەی لە دروست کردنی بەرەیەکی موسوڵمانان دژی خاچیەکان ، پاشان شێرکۆ لەگەڵ بورهانەدین بەلخی نوانییان وەك نوێنەری حەلەب یەك پارچەیی خاکی موسوڵمانان بپارێزن بێ ئەوەی خوێن برژێت ، هەردوولا پێك بێن، ئەمەش لەڕێگەی پەیوەندی کردن بە ئەجمەدین ئەیوبی برایەوە، کە نوێنەری موجیرەدین بوو نزیك بووەنەوە لە یەك و بڕیار درا، کە پەیمانی کۆن نوێ بکرێتەوە و مەرجەکانی جێ بەجێ بکرێت لە لایەن فەرمانڕەوای دیمەشق . لە (١٠) ی بەهاری کۆتایی ساڵی ( ٥٤٦ك / ١١٥١ ز ) دا نورەدین مەحمود ، شێرکۆ و میرەکانی ئرو لەشکرەکەی گەڕانەوە بۆ حەلەب . دوای ماوەیەکیش موجیرەدین ڕووی کردە شاری حەلەب ، لە ڕۆژی پێنج شەممە (١٢) ی ڕەجەب زۆر بەڕێزەوە پێشوازی لێ کراو میوانداریەکی چاك کراو پاشان گەڕایەوە بۆ دیمەشق[2] .

---

(١) ذيل تاريخ دمشق، ل ٣١٢ ، ٣١٥ ؛ الروضتين ، ج١ / ل٧٠ ؛ البداية والنهاية ، ج١٢ / ل٢٤١.

(٢) ذيل تاريخ دمشق ، ل٣١٢ ــ ٣١٣ ؛ مراة الزمان ، ج٨ / ق١ / ل ٢١٠ ؛ الروضتين ، ج١ / ل٨٠ ـ ٨١ ؛ ابن شاكر الكتبي: عيون التواريخ ، ج١٢ / ل٤٤٢ .

## ٢- گرتنی دیمەشق

### سالّی ( ٥٤٩ ك / ١١٥٤ ز )

ئەو گۆڕانکارییە سیاسیانەی لەو کاتەدا ڕویان ئەدا پێویستی کرد، کە نورەدین مەحمود بیر لەگرتنی دیمەشق بکاتەوەو بیخاتە ناوبەرەی خۆیەوە ، ئەم کارەش بە گەورەترین دەستکەوتی سیاسی دادەنرا، خاچیەکانیش هەمیشە ترسیان هەبوو لەم یەکگرتنەو بەکارێکی زۆرخرا پیان دادەنا بۆ خۆیان. سوڵتان نورەدین دەیویست هەرچۆنێك بێت بەردەوام بوونی پەیوەندی لەگەڵ مجیرالدین دەستەبەر بکات ،لەبەرئەوە زۆر کات بە ڕووی خۆشەوە دیاری بۆ دەنارد ، تازیاتر بڕوای پێ بکات[1]. لەبەرئەوەی نورەدین و میرە گەورەکانی بەوریاییەوە بەدوای بارودۆخەکەدا دەچوون چونکە خاچیەکان هەر دەرفەتێکیان بۆ بڕەخسایە شوێنێکیان داگیردەکرد ، وەك لەسالّی ( ٥٤٨ ك / ١١٥٣ ز ) شاری عەسقەلانیان داگیر کرد[2] .

لەگەڵ ئەوەشدا زۆر داوای یارمەتیان لە نورەدین کرد، بەلاّم نەیتوانی هیچ بکات، لەبەر ئەوەی دیمەشق لەنێوان حەلەب و شاری عەسقەلان دا بوو[3]، لەهەمان کاتیشدا چاویان خستبووە سەر دیمەشق و داگیری بکەن[4] کاتەکەیش زۆر لەباربوو ، هەر لایەك دەست پێشکەر بێت لەم کارەدا، ئایا سوڵتان نورەدین مەحمود بێت یان خاچیەکان ؟ چونکە باری ناوخۆی دیمەشق زۆر تێکچوو بوو ، وەك ململانێی ناو میرەگەورەکان[5] و زۆر دارای و زوڵمی نارەوای مجیرالدین، کە ئەیکرد بەرامبەر هاولاّتیان ،لەوانە دەست گرتن بەسەر سامان و ماڵیان و گرتنی زۆر لە پیاوماقولاّنی شارەکە سەرباری ئەمانەش بەردەوام نامەی دەنارد بۆ خاچیەکان، سالاّنەش لەداهاتی ناوچەکە بێبەشی نەئەکردن. کار گەیشتە ئەوەی چەند میرێك داوای فریاکەوتن لە نورەدین بکەن[6] نورەدین یش لەوە دەسڵەمیەوە، کە مجیر الدین شارەکە بداتە دەست خاچیەکان[7] و بەم کارەش ئەوەندەی تر خاچیەکان بەهێز دەبن. لەبەرئەوە سوڵتان نورەدین کەوتە بەکارهێنانی فێڵ لەگەڵی دا لەسەرێکەوە هەوڵی دەدا دڵنیای بکات لەخۆی ،لەلایەکی ترەوە پیلانی دادەنا بۆ لاواز کردنی دەسەلاّتەکەی لە ناوخۆ. ئەویش بە دروستکردنی گومان بەرامبەر سەرکردەو میرەکانی خۆیدا بەهۆی ئەو نامانەوە، کە ناوبەناو نورەدین بۆی دەنارد، بۆی دەنوسی کە نوسراوم بۆ هاتووە دیمەشق بدەنە دەستم ، مجیرەدین یش دەکەوتە گرتن و کوشتنی میرەکانی لەوانە ( عطاء کوڕی حافظ ) ،کە دڵسۆزترین میری خۆی بوو کوشتی ، لەسەرێکی

تریشەوە پەیوەندی دەکرد بەدانیشتوانی دیمەشقەوە، تاکو پشتگیری لە رزگارکردنی دیمەشق دا بکەن [٨] . بارودۆخەکە تا دەهات ناسکتر دەبوو، تا کارگەیشتە ئەوەی بڕیاری گرتنی بدات ، بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی بەهێز دژی خاچییەکان پاش ئەوەی خەلیفەی عەباسیش ( المقتفی باللە ) بە نوسراوێك پشتگیری کرد. لەساڵی ( ٥٤٩ ك / ١١٥٤ ز ) دا فەرمانیدا بە سەرکردەو پێشەوای لەشکرەکەی شێرکۆ وەك نوێنەرێك بچێت بۆ دیمەشق ، شێرکۆیش لەگەڵ هەزار سوارە بەرەو دیمەشق کەوتە ڕێ ، گەیشتە ناوچەی ( قەصەب ) ، لە ( مەرەج ) پشتی دیمەشق لایانداو وەستان.

پەراوێزەکان / ----------------------------------

(١) الكامل ، ج٧ / ل١١٠ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣٠٢ ؛ الروضتين ، ج١ / ل٨٣ ، ٩٥ ؛ تتمة المختصر في اخبار البشر ، ج٢ / ل٨٧ ؛ الصدفي : تاريخ دول الاسلام ، ل١٨٦ .

(٢) تاريخ الباهر ،ل ١٠٦ .

(٣) الكامل ، ج٧ / ل١١٠ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣٠٢ .

(٤) الروضتين ، ج١ / ل٩٥ ؛ البداية و النهاية ، ج١٢ / ل٢٣٢ .

(٥) مفرج الكروب ، ج١ / ل١٢٦ ؛ تتمة المختصر في اخبار البشر ، ج٢ / ل٥٥ ؛ ارنست باركر : الحروب الصليبية ، ل ١٥٨ .

(٦) مراة الزمان ، ج ٨ / ق١ / ل٢٢٠ ؛ عيون التواريخ ، ج١٢ / ل٤٧٨ .

(٧) تاريخ الباهر ، ل١٠٦ ؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل١٢٦ .

(٨) الكامل ، ج٧ / ل ١١٠ ؛ مراة الزمان ، ج٨ / ق١ / ل٢٢١ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل ٣٠٤ ـ ٣٠٥ ؛ الروضتين ، ج١ / ل ٩٥ ؛ الغزي : نهرالذهب في تاريخ حلب ، ج٣ / ل٩٣ ؛ Stevenson. The crusaders . p. 172

له (٢٠) ی محەرەمی سالی (٥٤٩ ك / ١١٥٤ ز) دا پێشوازی نەکران و هیچ میرێك و کاربەدەستێکی شارەکە نەهاتە دەرەوە بۆ لایان ، شێرکۆ زۆر دلگران و تورە بوو ، جوابی بۆ سولتان نورەدین نارد، تا لەم کارە ئاگادار بێت .

(ئیبن ئەبی تەی) دەڵێت : " مجیرەدین وای زانیوە ئەمە فێڵە، کە ئەو هەموو سەربازەی بینیوە لەگەڵ شێرکۆ " دا، سولتان نورەدین ئەم کارەی بە سوکایەتی کردن دانەنا پێیان لەبەر ئەوە بە خۆی و لەشکرێکەوە هاتە سەر دیمەشق و گەمارۆی دا .[1] لە هەمان کاتدا رێگەی لەو کاروانانە گرت کە لە باکورەوە گەنمیان دەهێنا بۆ شاری دیمەشق ، ئەمەش بوو بەهۆی بەرز بوونەوەی نرخی خواردن لەناو شاردا ، پاشان لای رۆژهەلاتی گرت و رووەو شوراکەی چوو، لەوێ گوریسیان بۆ هەڵدان و سەربازەکان پیایدا سەرکەوتن و دەرگایان کردەوە ،

شێرکۆ و سەربازەکانی چوونە ژوورەوە، دوای ئەوان سولتان نورەدین و دەست و پێوەندی چوونەتە ژوورەوە، مجیرەدین، کە هەستی بەبەزاندنی خۆی و دەست و پێوەندەکەی کرد ، خۆیان گەیاندە ناو قەڵاکە، چاوەڕێی یارمەتیشی دەکرد لەقۆڵی خاچیەکانەوە، کە داوای کردبوو، بەڵام بەدەنگیەوە نەهاتن .

نورەدین داوای لە شێرکۆ کرد پەیوەندی بە براکەیەوە (ئەیوب) بکاتەوە ،تا یارمەتیان بدات لەگرتنی قەڵاکەدا ، شێرکۆش بۆ براکەی نووسی و وتی: پێویستە ئەم کارە ئەنجام بدەن، چونکە مجیرەدین پاڵی داوە بەخاچیەکانەوە لەوانەیە دیمەشقیان بداتێ ، ئەیوبیش داوای براکەی بەجێ هێنا لە هەمان کاتدا مجیرەدین یشی دڵنیاکرد لە سەرو سامان و دەست و پێوەندی و پێی وت: کە شاری حمصی دەداتەوە دەست، مجیرەدین چووە ناو خانووی باپیری و دوای چەند رۆژێك چوو بۆ شاری حمص و زۆری لێ نەبوو لێی سەندرایەوە ،بەهۆی پیلانگێرانی دژی نورەدین و پەیوەندی کردنی بەچەند هاورێیەکی خۆیەوە لە دیمەشق وەشاری (بالس) ی[2] لەسەر رووباری فورات درایە بەڵام قبولی نەکرد و تورەبوو رووی کردە شاری بەغداد بۆ نیشتەجێ بوون[3] .

شێرکۆ کرا بەفەرمانڕەوای دیمەشق[4] لە مانگی محەرەمی سالی (٥٤٩ ك/ ١١٥٤ز) دا وەك جێگری نورەدین دەستبەکار بوو لە پۆستی نوێدا جلەوی دەسەڵاتی گرتە دەست و تا ماوەیەك مایەوە[5] بەئەنجامدانی ئەمکارەش یەکپارچەیی خاکی شام هاتە دی ، مێژوونوسان ئاماژە بۆ شێرکۆ دەکەن ،کە دەستی بالای لەم کارەدا هەبووە[6]، لەو ساوە دیمەشق بووە مەڵبەندی بەرهەڵستی خاچیەکان لەجیاتی شاری حەلەب .

پەراوێزەکان / ----------------------------------

(١) الروضتين ، ج١ / ل٩٦ .
(٢) بالس : شارێکە لەنێوان حەلەب و رەقەدایە . ( معجم البلدان ، ج١ / ل٣٢٨ ) .
(٣) ذيل تاريخ دمشق ، ل٣٢٦ ، ٣٢٩ ؛ الكامل ، ج٧ / ل ٢٠٠ ـ ٢٠١ ؛ مراة الزمان ، ج٨ / ق١ / ل٢٢٢ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣٠٥ .
(٤) ذيل تاريخ دمشق ، ل ٣٢٩ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣٠٥ ؛ شفاء القلوب ، ل٢٥ ؛ زامباور : معجم الانساب ، ل٤٧ .
(٥) تهذيب تاريخ دمشق الكبير ، ج٦ / ل ٣٦٠ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣١٨ ؛ السيد الباز العريني : الشرق الادنى و الأيوبيين ، ل٢٦ ؛ حسين مؤنس : نورە دين محمود ، ل٢٤٦ .
(٦) تاريخ الباهر ، ل ١٠٨ ؛ الروضتين ، ج١ / ل١٣٠ .

## ٣ـ ئەنجامەكانی گرتنی دیمەشق

لەڕاستیدا گرتنی دیمەشق لەلایەن لەشكری نورەدین مەحمودەوە خاڵی وەرچەرخانێكی گرنگ بوو لە مێژووی شەڕو شۆڕی خاچپەكاندا ، چونكە لەدوای ئەم هەنگاوە وڵاتی شام بەسەرۆكایەتی نورەدین مەحمود یەكی گرت، كە پایتەختەكەی دیمەشق بوو ، بە هۆی گرنگی شوێنەكەشیەوە ،كە بڕیاری لەسەر سیاسەتی شام ئەدا ،كرایە بارەگاو بنكەی سەرەكی سەركردایەتی بەرەی ئیسلامی شام و جەزیرەی فورات و هەتا رووباری بەرەدا .

بەم كارەیش بەشێكی گەورە لە سیاسەتی نورەدین هاتە دی و لە هەمان كاتیشدا بووە هۆی كەمكردنەوەی گرنگی سەركەوتنەكەی خاچپییەكان لەگرتنی ( عەسقەلان )دا ، هەروەها بەم یەكگرتنەوەیە مەملەكەتی( بيت المقدس ) گەورەترین هاوڕێی لەدەست دا لە ناوچەكەداو حوكمێكی لایەنگریان نەما ، لەسەرێكی ترەوە جۆرە هاوسەنگی‌یەك دروست بوو لەنێوان هێزەكانی موسوڵمانان و هێزەكانی خاچپەكان لە وڵاتی شام دا [1] . چونكە ئەگەر خاچپەكان لە كەناراوەكانی ئەسكەندەروونەوە لە باكوور هەتا غەززە لە باشووریان داگیر كردبێت ، نورەدین یش دیمەشقی خستوەتە سەر دەوڵەتەكەی و نزیك بووەتەوە لە سنورەكانی میرنشینی ئەنتاكیەو تەرابلس و ( بيت المقدس ) بەمەش رێگای بۆ ئاسان بوو، كە نورەدین لەكاتی هەڵگیرساندنی شەڕدا چ كاتێك و كوێی بوێت دەتوانێ گورزی كوشندەی ئاراستە بكات لە باكوور و باشوور [2] . بەم شێوەیە توانای بەرگری موسوڵمانان زیادی كرد لەبەر دەم خاچپەكاندا ، لە هەموو لایەنێكەوە جگە لە فراوان بوونی بەرەی شەڕكردن لایەنی ئابوری و مرۆیشی گرتەوە .

هەروەها پێشەواو میرەكانی شام قسەیان بوو بەیەك، بەمەش مەترسیەكی گەورە لەسەر شارەكانی خاچپەكان دروست بوو، بەتایبەتی ( ئۆرشەلیم - قدس ) بە شێوەیەك وەك گەمارۆ درابن وابوو ، لەبەر ئەوەی وەك جاران ئەیان دەتوانی بێنە ناو قوڵایی خاكی موسوڵمانانەوە لە شام دا ،لەگەڵ ئەوەشدا زەوی خاچپەكان لە پێوانە و ساماندا زیاتر بوو لە خاكی موسوڵمانان، بەڵام ئەوەی جیاواز بوو خاكی موسوڵمانان لە شام دا بوو بەیەك پارچەو یەك سەركردەشی هەبوو [3]

ئەمەش ئەنجامێکی وای لێکەوتەوە بەجۆرێك گوشاری خستە سەر خاچیەکان، کە پەنابەرنە بەر ناردنی نامەو خۆنزیك کردنەوە لە نورەدین بۆ خۆپاراستن لە ئاگری شەڕەکانی [4].

پەراوێزەکان / ----------------------------------

(١) ذيل تاريخ دمشق ، ل٣٣٠ ؛ تاريخ الباهر ، ل١٠٨ ؛ مراة الزمان ، ج٨ / ق١ / ل٢١٤ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣٠٣ . ٣٠٤ ؛ الروضتين ، ج١ / ل٩٤ . ٩٥ ؛ ارنست باركر : الحروب الصليبية ، ل٥١ ، ٧٨ .

(٢) تاريخ الباهر ، ل١٠٧ . ١٠٨ ؛ مراة الزمان ، ج٨ / ق١ / ل٢٢١ ؛ شاكر احمد ابو بدر : الحروب الصليبية و الاسرة الزنكية ، ل٢٣٦ . ٢٣٧ .

(٣) الروضتين ، ج١ / ل ٩٨ . ٩٩ ؛ محمد علي الغتيت : الصراع بين الشرق و الغرب ، ل٤١ ؛ ارنست باركر : الحروب الصليبية ، ل٥١ ؛ رانسيمان : الحروب الصليبية ، ج ٢ / ل٥٥١ .

(٤) الروضتين ، ج١ / ل١٠١ .

دەسکەوتی تری ئەم یەکگرتنەوەیە ئەوە بوو، کەرێگەی ئاسان کرد وەك خاڵێکی سەرەتایی بۆ هەنگاو نان لە چاودێری کردنی باری سیاسی ناوخۆی ( میسر )[1] دا، لە پێناوی گەرانەوەی بۆ باوەشی خەلافەتی عەبباسی لە کاتی گونجاودا[2] .

لەهەمان کاتدا گرتنی دیمەشق هۆکارێك بوو بۆ زیندوو کردنەوەی رێباوەری ( مەزهەبی ) سوننی ، کە نورەدین مەحمود گرنگی پێدەدا لە ولاتی شام دا[3] . سەرباری ئەمانەش هەمووی گرتنی دیمەشق لەلایەن نورەدین مەحمودەوە کاریگەری گەورەی هەبوو ، لە بلاوکردنەوەی رۆشنبیری ئیسلامی و گەشەسەندنی لە شام دا[4] .

پەراوێزەکان / ------------------------------------

(١) خاشع المعاضيدي و اخرون : الوطن العربي و الغزو الصليبي ، ل٩٧ .

(٢) محمود السرطاوي : نور الدين و الادب العربي ، ل١٠٤ .

(٣) السد الباز العريني : الشرق الاوسط و الحروب الصليبية ، ج١ / ل٦٠١ .

(٤) محمود ياسين التكريتي : الايوبيون في شمال الشام و الجزيرة ، ل٦٠ .

## بەشی یەکەم :

## شێرکۆو شەڕی خاچییەکـان لـە شـام

### یەکەم ـ

### شەڕی ئەرتاح ( ٥٤١ ك / ١١٤٦ ز )[١]

خاچیەکان لەدوای کوشتنی ( عیمادەدین ) زەنگی تەواو دڵخۆش بـوون، بـەو هیوایەی جێگرەکەی لە شاری حەلەب باشتر دەبێت بۆیان، بەڵام ڕۆژگار بـۆی دەرخسـتن کە نورەدینی کوڕیشی سورە لەسەر بـەرگری لـە خاکی موسـوڵمانان و بـەردەوام لەسـەر غەزاکردن جەخت دەکات ، وەك پێویستییەکی ئایینی بۆ مەسەلەی شـەڕی خاچیـەکان دەڕوانێ و بۆ ئەو مەبەستەش بەردەوام شێرکۆی لەگەڵدا بوومو لەو چالاکیانەدا بەشـدار بوو، کـە دژی خاچیـەکان کـراوە ، وەك پێشـەوای لەشـکرەکەی ، لەهـەندێ چـالاکی سەربازی دا شێرکۆ فەرماندەی شەڕەکانی کردوومو ڕاپەڕاندووە ، باشـترین نموونـەیش شەڕی ئەرتـاحە. کە شێرکۆ تێیدا ناسرا بەرزگارکەری دەوڵەتەکەی نورەدیـن مـەحمودو دورخستنەوەی مەترسی خاچیەکان لەسەر ناوچەکە[٢] .

( ئیبن ئەبی طي) دەڵێت: حەوت ڕۆژ تێپەڕ ببوو بەسەر فەرمانڕەوایی نورەدین مەحموددا لە شاری حەلەب لە ساڵی ( ٥٤١ ك / ١١٤٦ ز ) دا،کـە دوای کوژرانـی بـاوکی .. میری میرنشینی ئەنتاکیە ( بوهیمەند ) کە بیستی عمادەدین زەنگـی کـوژراوە بەهـەلی زانی و لەشکری کۆکردەوە بۆ پەلاماردانی خاکی موسوڵمانان لەبەشی باکورو ناوەڕاستی وولاتی شامدا[٣] لەشکرەکەی کردە دوو بەش بەشێکی بەرەو شاری ( حماە ) بـەڕێی کـردو ئەوەیش کە مایەوە لەژێر فەرماندەی خۆیـدا کەوتـە پـەلاماردانی ناوچـەکانی دەوری حەلەب ،کەوتنە وێرانکردن و کوشتنی ژمارەیەك و بەدیل گرتنی هەندێکی تریـش لـە دانیشتوانەکەیان و تاڵانکردنی سامانی ناوچەکەیش[٤] .

---

(١) ئەرتاح : قەڵایەکی پتەو و قایم بووە سەر بەشاری حەلەب بوو ، کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی دەریاچەی ئەنتاکیە . ( معجم البلدان ، ج١ / ل١٤٠ )

(٢) زبدة الحلب ، ج٢ / ل٢٩١ : الروضتين ، ج١ / ل٤٨ ؛ تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج ١ / ل٥٢ : السيد الباز العريني : الشرق الادنى والايوبيون ، ل٢٦؛
Zoeoldenbourg. The crusaders. P 321 – 322

(٣) لە الروضتين ، ج١ / ل٤٨ وەرگیراوە .

(٤) الكامل ، ج٧ / ل٦٢ ؛ الروضتين ، ج١ / ل ٤٨ : شاكر أحمد ابو بدر : الحروب الصليبية و الاسرة الزنكية ، ل٢٦٠ .

ئەم هەواڵەش بەخێرایی گەیشتە شاری حەلەب ، شێرکۆ بۆ تۆڵەسەندنی موسوڵمانان ، لەماوەیەکی کەمدا بێ گوێدانە ژمارەی سەربازەکانی ئەوەندەی لەشاری حەلەب بوو، لەشکرێکی لێ پێکهێناو ڕووی کردە شوێنی ڕووداوەکە، لەشکری خاچیەکان ژمارەیەکیان شوێنەکانیان بەجێهێشتبوو ئەوانەی مابوونەوە دیلەکانیان دەگواستەوە.

شێرکۆ دوای پلان دانان و هەڵمەت بردنە سەر، زۆربەی سەربازە خاچیەکان کوژران و دیلەکانیش ئازادکران و ئەو تالانیەشی کردبوویان لێیان سەندرایەوەو درایەوە بەخاوەنەکانیان .بەلام شێرکۆ بەمەش قایل نەبوو .بەڵکو کەوتە شوێن لەشکری خاچیەکان، تا گەیشتە ( ئەرتاح ) و پەلاماریدان و دەستی بەسەردا گرتن و بەتایبەتی ئەوەی خاچیەکان خاوەنی بوون لەگەڵ خۆی هێنای و بەسەر بلندی گەڕایەوە شاری حەلەب [1] .

بەم چالاکی و جموجۆلە ئەبەردانەیە پلانی خاچیەکانی بەتاڵ کردەوە ،کە نیازیان وا بوو دوای کوژرانی زەنگی دەست بگرنەوە بەسەر ئەو زەویانەدا ،کە لەوەو بەر لێیان سەندبوون و سەر لەنوێ بیخەنەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان .

---

(١) مراة الزمان ، ج٨ / ق١ / ل١٩٥ ؛ الروضتين ، ج١ / ل٤٨ ؛
Steven, The crusaders in the east. P. 156
Zoeoldenbourg. The crusaders. P. 321 – 322

دووەم

## شـــــــەڕی یەغــری

( ٥٤٣ ك / ١١٤٨ ز )

ئـەم شـەڕە لەسـاڵی ( ٥٤٣ ك / ١١٤٨ ز ) دا لـە شـام ڕووی دا، لــەنێوان لەشــکری موسوڵمانەکان بــە فـەرماندەی نورەدیــن مـەحمود فـەرمانڕەوای شـاری حەلـەب لەگــەڵ خاچیەکان بەفەرماندەی ( ریموند ) میری میرنشینی ئەنتاکیە، شوێنی ڕوداوەکــەیش لـە قولایی زەوی خاچیەکاندا بوو لە نزیك ناوچەی فامیا [1].

مێژوو نووسان هەریەکەیان بەچەند جۆرێك باس لــە سـەرەتاو هۆکـاری بنـەڕەتی سەرهەڵدانی ئەم ڕووداوە دەکەن ، هەیانە دەڵێــن :سـوڵتان ( مەسـعود ) ی فـەرمانڕەوای قۆنیە لە ئاسیای بچووك پەنای بۆ نورەدین هێناوە لە شەڕکردنیدا لەگــەڵ خاچیــەکان و داوایان لێ کردووە ، کە بەهانایەوە بێت و بە لەشکرەوە بچێتە سەر میرنشینی ئەنتاکیە تا بەهۆیەوە فشاری خاچیەکانی لەسەر کەم بێتەوە [2]. ( ئیبن ئەثیر ) یــش دەڵێـت : خـاڵی سەرەتاو دەست پێکردن لـەلای خاچیەکانـەوە بـووە و ئـەوان نیازیـان بـووە ، پـەلاماری ناوچەکانی نزیك شاری حەلـەب بـدەن ، بـەلام سـوڵتان نورەدیـن پـێی زانیـوەو دەسـت پێشکەری کردووەو بەرەو ڕویان وەستاوە [3] . جگە لەمەش بۆچونێکی تر هەیە، کە دەڵێـت : لەساڵی ( ٥٤٣ ك / ١١٤٨ ز ) دا دوای کشانەوەی سوپای هێرشی دووەمی خاچیەکان لە شام

. . . سوڵتان نورەدین بڕیاری داوە دەست بکاتەوە بە غەزاکردن ئەویش بە هەڵکوتانە سەر میرنشینی خاچیەکان لە شامدا ، پاش ئەم بڕیــارە بــە لەشـکرەوە بـەرەو ڕوی میرنشـینی ئەنتاکیە ڕۆیشتووە و میر ( ریمۆند ) یش بۆسەیەکی بۆ ناوەتــەوە تــا لــە ناکــاو لێدانــی کوشندە ناراستەی سوپای موسوڵمانەکان بکات ، لە ئەنجامدا توانیویەتی کە بەمەبەسـتی خۆی بگات و شکست بە موسوڵمانەکان بهێنێت [4] .

---

(١) ذيل تاريخ دمشق ، ل٣٠٢ ؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل١١٤ ؛
Zoeoldenbourg. The crusaders. P. 165

(٢) رانسيمان : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل٥٢٤ ؛ حسين مؤنس : نور الدين محمود ، ل٢٣٣ ؛

(٣) الكامل ، ج٧ / ل٧١ ؛

(٤) ذيل تاريخ دمشق ، ل٣٠٢ ؛ الروضتين ، ج١ / ل٥٥ ؛
Zoeoldenbourg. The crusaders. P. 165

( ئەبو شامە ) بەناوی ( ئیبن ئەبی طي) ڕووداوەکە باس دەکات و دەڵێت : هۆکاری سەرەکی شکست هێنانی لەشکری نورەدین مەحمود لە شەڕی یەغری‌دا دەگەڕێتەوە بۆ بەشداری نەکردنی شێرکۆ لەو شەڕەدا [1] .( رانسیمان ) دەڵێت : هەردوو سەر لەشکرەکەی نورەدین ،شێرکۆ و مجیرەدین لەو کاتەدا دەنگیان هاتووە لەگەڵ یەکتر ،کە خاچییەکان شالاویان بۆ هێناون و هەر لەو ساتەشدا شێرکۆ خۆی دوورخستوەتەوە لەبەرەی شەڕو بڕیاری بەشداری نەکردنی داوە [2].

دوای ئەم تێك شکاندنە لەشکری موسوڵمانەکان گەڕاونەتەوە بۆ شاری حەلەب دوای برینداربوون و کوژرانی ژمارەیەك لە موسوڵمانەکان [3] . نورەدین مەحمود بەژیری و دانایی خۆی، کەوتوەتە چارەسەری ئەم کێشەیەو بە لێزانی دڵی شێرکۆی داوەتەوە و بە هۆی ئەم ڕووداوەوە بەباشی بۆی دەرکەوت ،کە چ دەورێکی باڵاو مەزن دەبینێ ،بەشدار نەبوونی شێرکۆ لەگەڵ لەشکرەکەیدا ، چ دەورێکی کاریگەری بینیوە لە شکست و بەزاندنی لەشکرەکەی‌دا [4] .

دواتر نورەدین بەسەر مجیرەدینی‌دا سەپاندووە، کە لەمەو دوا شوێن و هەقی شێرکۆی لەبەر چاو بێت و ئینجا هەردوکیانی ئاشت کردوەتەوە و پێکی هێناونەتەوە [5] . لەلایەکی ترەوە ( ئیبن ئەثیر ) : دەربارەی ئەم شەڕە نورەدین مەحمود بەسەرکەوتوو نیشان دەدات [6] ، ڕاستیەکەشی بە پێچەوانەوە بووە [7] .

---

(١) الروضتين ، ج ١ / ل٥٥ .
(٢) رانسيمان : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل٥٢٤ .
(٣) ذيل تاريخ دمشق ، ل٣٠٢ .
(٤) الروضتين ، ج١ / ل٥٥ ؛ الحروب الصليبية ، ج٢ / ل٥٢٤ .
(٥) ذيل تاريخ دمشق ، ل٣٠٢ ؛ الروضتين ، ج١ / ل٥٥ .
(٦) الكامل ، ج٧ / ل٧١ .
(٧) ابو شامە : سەبارەت بەشکستی نورەدین لەم شەرەدا هۆنراوەیەکی (ابن منير)ی حەلەبی نوسیوە کە لە سەرەتاکەیەوە دەڵێت :

لم يشنه من ماء يفرا ان فر        الاشابات زاد عنها انزلاقه

( الروضتين ، ج١ / ل٥٥ )

سێیەم

## شەڕی ئانب [1]

( ٥٤٤ك / ١١٤٩ز )

شکستهێنانی لەشکری موسڵمانەکان لەشەڕی یەغری دا شتێکی کەم نەبوو ، کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر دەروون و هەستی موسڵمانەکان دروست کرد ، لای سەرکردەکانیش تاڵتر بوو ، لە لایەکی ترەوە ( ریموند ) ی میری میرنشینی ئەنتاکیە سوور بوو لەسەر بەردەوام بوونی شاڵاوی خاچیەکان بۆ سەر ناوچەکانی نزیك شاری حەلەب ، مێژوو نوسان بە دوژمنی دووەمی نورەدینی دادەنێن لە دوای ( جۆسلین ) [2] ، و خەلیفەی عەبباسیش ( المقتفي بالله ) لەم بارو دۆخە نا هەموارەی شام بە ئاگا بوو ، لەبەر ئەوە داوای لە میر و خێڵە تورکمانەکانی دانیشتوانی شام کرد ،کە پشتگیری لە نورەدین مەحمود بکەن دژی خاچیەکان [3] .

نورەدین لەساڵی ( ٥٤٤ك / ١١٤٩ز ) دا نوێنەری بۆ دیمەشق نارد داوای یارمەتی سەربازی لە ( معين دين أنر ) کرد ، بەو نیازەی کە دەستەڵاتی جارانی دیمەشق بۆناو بەرەی غەزاکە، دژی میرنشینی ئەنتاکیە رابکێشێت [4] و داواکەیان پەسەند کردو لە شکریان بۆ نارد لە دیمەشقەوە و لە دژی خاچیەکانیش جەنگان [5] .

نورەدین دوای رێکخستنەوەو کۆکردنەوەی ژمارەیەکی پێویست لە سەرباز بڕیاری دا رووەو شاری ئەنتاکیە بڕوات ، لەو ساتەدا لە شکرەکەی بە شەش هەزار جەنگاوەر مەزندەکراوە ئەمەو سەرەرای ژمارەیك لە دەست و پەیوەند، کە لەگەڵیدا بووە [6] .

لەسەرەتادا لەشکری موسڵمانەکان روویان کردە قەڵای حارم [7] و گەمارۆیانداو دەستیان بەسەریدا گرت و بەوێرانکراوی بەجێیان هێشت [8]. پاشان لەشکری موسڵمانەکان روویان کردە قەڵای ئانب لە رۆژهەڵاتی رووباری عاصی و گەمارۆی ئەمیشاندا [9].

---

(١) ئانب : قەڵایەکە سەر بەعەزازەیە لەدەوری شاری حەلەبدایە. (معجم البلدان ، ج١ / ل ٢٥٨ ) .

(٢) تاريخ الباهر ، ل ٩٩ ؛ ابن شاكر الكتبي: عيون التواريخ ، ج١٢ / ل ٤٢١ ؛ قدري قلعجي : صلاح الدين ، ل١٣٤.

(٣) خەلیفەی عەبباسی ئەم کاەی بە (شمس الدين ناصح) الاسلامي نوێنەری خۆیی سپارد کەسەردانی شام بکات بۆ ئەم مەبەستە . (شاكر أحمد أبوبدر: الحروب الصليبيه والاسره الزنكيه : ل ٢٧٢ ـ ٢٧٢ ) .

(٤) ذيل تاريخ دمشق ، ل ٣٠٤ ؛ مراه الزمان ، ج٨ / ق١ / ل ٢٠١؛ عيون التواريخ ، ج١٢ / ل٤٢١ ؛ سعيد عاشور: الحركه الصليبيه ، ج٢ /ل ١٢١ .

(٥) لەشکری دیمشق بەفەرماندەی غەزاکەر (بەزان کوری مامین) گەیشتە لای نورەدین محمود، ژمارەیان هەزار سەرباز بوو (الكواكب الدريه في السيره النوريه ، ل١٣٠ ؛ عيون التواريخ ، ج١٢ /ل ٤٢١ )

(٦) الكامل ، ج٧ / ل ٧٧ ـ ٧٨ ؛ الروضتين ، ج١ / ل ٥٧ ـ ٥٨.

(٧) حارم : قەڵایەکی پتەوە شوێنێکی گرنگی هەبووە لەسەر رێی ئەنتاکیەو سەر بە شاری حەلەبە . (معجم البلدان ، ج٢ / ل ٢٠٥ ) .

(٨) الكامل ، ج٧ / ل ٧٧ ؛ تتمه المختصر في اخبار البشر ، ج٢ / ل ٧٦ ؛ سيد على الحريري : اخبار السنيه و الحروب الصليبيه ، ل ١٠١ .

(٩) تاريخ الباهر ، ل ٩٩ ؛ الروضتين ، ج ١ / ل ٥٨ ؛ كامل الغزي : نهر الذهب في تاريخ حلب ، ج٢ / ل ٩١ ؛ رانسيمان : الحروب الصليبيه ، ج٢ / ل ٥٢٤ .

ئەم دەنگ و باسی هەڵمەتە سەربازیانەی نورەدین و شێرکۆ گەیشتەوە شاری ئەنتاکیە ، ریمۆند بە پەلە کەوتە کۆکردنەوەی لەشکرەکەی، کە بە (٤٠٠) سوارەو (١٠٠٠) پیادە مەزندە کراوە [١] . هەروەها (رینۆ)ی میری مەرعەش خۆی و هێزەکەی پەیوەندیان بە لەشکرەکەی ئەنتاکیەوە کردوەو پۆستی جێگری ریمۆندیشی لەم هێرشە سەربازەیەدا وەرگرتووە ، لە هەمان کاتدا ( عەلی کوری وفاء ) سەرۆکی باطنیەکانی شام لەگەڵ گروپێك لە هاورێکانی پەیوەندیان بە لەشکری خاچیەکانەوە کرد دژی موسڵمانەکان لە ئەنتاکیە [٢] و پاشان ریمۆند بەرەو قەلای ئانب هاتووە بۆ بەرەنگار بوونەوە لەگەڵ موسڵمانەکاندا [٣] ، لەکاتێکدا لەشکری خاچیەکان رووبان کردە بەرەی شەر ، نورەدین مەحمود ، شێرکۆی پێشەوای لەشکەرەکەیی و سەرلەشکرەکانی تر بریاریاندا کە پیلانێکی ژیرانە دابرێژن، تا بەو هۆیەوە گورزێکی کوشندەو زیانێکی زۆر لە خاچیەکان بدەن [٤] . بۆ ئەم مەبەستەش بریاریاندا ،سەربازگە بەرنە شوێنێك بۆ شەر لەبار بێت و بەم پێیە رووبان کردە باشوور ، بۆ دەشتاییەکانی رۆژئاوای ( عەین مراد ) لەنێوان قەلای ( ئانب ) و زەنگاوی ( غاب )دا یە لەم کاتەیشدا لەشکری خاچیەکان بەفەرماندەی ریمۆند لە ٢٨ی تەموزی ساڵی ( ٥٤٤ك / ١١٤٩ز ) گەیشتە زەویەیە نزماییەکانی نزیك عەین مرادو سەربازگەیان دانا، چواردەوریشیان بەبەرزایی دەورە درابوو ، بێئەوەی سەرکردایەتی خاچیەکان گرنگی پێ بدات ، نورەدین مەحمودیشی لەگەڵ شێرکۆ بریاری گەمارۆدانی خاچیەکانیان دا ، هەر ئەو شەوە دوای خۆی کەوتن ریمۆند پێی زانی و دەوری سەربازگەی بەسەر کردەوە بیری لە رێگایەك دەکردەوە تا گەمارۆی سەریان بشکێنێ و هەوڵی دا، بەلام بێسوود بوو، لە هەرچوارە لاوە شەر دروست بوو ، موسڵمانەکان پەلاماری خاچیەکانیانداو شەرێکی قورس لە رۆژی چوارشەممە ٢١مانگی سەفەر ساڵی ( ٥٤٤ك/ ١١٤٩ز ) هەڵگیرسا [٥] .

سوپای خاچیەکان بەرەنگاری موسڵمانەکان هێزی خۆیان خستبووە کارو چالاکیەکانی شێرکۆش لەم شەرەدا، وەك ئەستێرەیەکی درەوشاوە ووزەو توانای دەبەخشیەوە سەربازەکانی ، ( ئیبن ئەبی طی ) دەگێرێتەوەو دەڵێت : شێرکۆ شالاوی بردەسەر ئەوکەسەی کە دروشمی خاچی هەڵگرتبوو، کوشتی [٦] . دواتر دەستبەجێ گەیشتە بارەگاو سەرکردایەتی ریمۆندو ژمارەیەکی زۆری لە سەرکردەو ناسراوەکانی خاچیەکانی کوشت . تاوەکو دەستی گەیشتبووە ریمۆندی فەرماندەی لەشکری خاچیەکان و بەدەستی خۆی کوشتبوی [٧] .

---

(١) الروضتين ، ج ١ / ل ٥٨ ؛ تاريخ الباهر ،ل ٩٩ ؛ Stevenson . The crusaders in the east . p . 166. بەلام لەبۆچوونێکی تردا بە (چوار) هەزار سوارەو (هەزار)

پياده دانراوه . ( مراة الزمان ، ج ٨ /ق١ / ل ٢٠١ ؛ حسين مونس: نورالدين محمود، ل٢٣٤ )

(٢) رانسيمان : الحروب الصليبية ، ج ٢ / ل ٥٢٥: سالم محمد حميدة : الحروب الصليبية ، ج٣ / ل ٥٧ .

(٣) دولة ال سلجوق ، ل ٢٠٥ ؛ تاريخ الباهر ، ل ٩٩ ؛ الصدفي : تاريخ الاسلام ، ل١٨٦؛
Zoeoldenbourg. The crusaders .P. 336 .

(٤) مراة الزمان ، ج ٨ / ق١ / ل ٢٠١ ؛ الروضتين ، ج١ / ل ٥٨ .

(٥) ذيل تاريخ دمشق ، ل ٢٠٥ ؛ المنتظم ، ج١٠ / ل ١٣٧ ؛ تاريخ الباهر ، ل ٩٩ ؛ الروضتين ، ج١ / ل ٥٨ ؛ رانسيمان ، الحروب الصليبية ، ج٢ / ل ٥٢٥ .

(٦) له الروضتين ، ج١ / ل ٥٨ وقركيراوه.

(٧) ذيل تاريخ دمشق ، ل ٢٠٥ ؛ دولة ال سلجوق ، ل ٢٠٦ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل ٢٩٨ ؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل ١١٤ – ١١٥ ؛
Cahen .claude : Lasyrie dunord .P .383 .
Zoeolden bourg. The crusaders .P. 336 .

وە ئەم چالاکیــەش وورەی موسـلمانەکانی زیـاتر بـەرزکردەوە ، بــوو بەمایـەی دەستەبەر کردنی سەرکەوتنی تەواو بەسەر خاچیەکاندا و ژمارەی کوژراوەکانیان بە هــەزار سەرباز بــەڵکو زیـاتریش مـەزندە دەکـرا[1]. لـەدوایدا لەشـکری موسـڵمانەکان تـا سـەر لەناراوەکانی دەریا رۆیشتن و گەیشتنە شاری ئەنتاکیە بەبێ ئــەوەی کـەس بـەرەنگاریان ببێت[2].

شێرکۆ بە بۆنەی سەرکەوتنەکانییەوە بەنازناوی ( أبو المظفر ) خەڵات کرا[3].

زیانی خاچیەکان هێندە زۆربوون ، کە زۆربەی فــەرماندەکانیان کـوژرا بــوون ، لەوانە ( رینۆ )ی فەرمانڕەوایی مەرعەش لەگەڵ زەعیمی باطنیەکان ( علی کوڕی وفــاء )[4]. لەکۆتـایدا موسڵمانەکان بەسەرکەوتوویی گەڕانەوە بۆ حەلەب و لەگەڵ خۆیـاندا ژمارەیەك دیلیان پێ بوو دەسکەوتێکی ئێجگار زۆر لەکەرەستەی جـەنگ ، شـێرکۆ دەسـتکەوتی زۆری لەچەك و دیل و ئەسپ هەبوو بەشێکی نارد بۆ نەجمەدینی برای لە دیمەشق[5].

لێرەدا ( ابو منیر )ی شاعیری حەلەب دەڵێت :

ان کان ال فرنج ادرکوا فلجا  في یوم یغرا ونـالو منیة الظفر

ففي الخطیم خطمت الکفر منصلتا  أبا المظفر بالصمصامة الذکر

نالوا بیغرا نهابا وانتبهت لنا  علی الخطیم نفوس المعشر البشر

وأستقود الخیل عریا وأستقدت لنا  قوامس الکفر من ذل وفي صفر[6]

شێرکۆ لەئەنجامی چالاکیەکانی ئەم شەڕەی ، ئەوەندەی تر لەبەرچاوی نورەدین مەحمودو سەرلەشکرو سەربازو میرەکانی شام شکۆدار تربوو[7].

---

(١) مراة الزمان ، ج٨ / ق١ / ل ٢٠١ ؛ زبدة الحلب ، ج١ / ل ٢٩٨ ؛ مفرج الکروب ، ج١ / ل ١٢٠ .

(٢) الروضتین ،ج١ / ل ٥٨ ؛ شاکر احمد ابو بدر : الحروب الصلیبیة ، والاسرة الزنکیه ، ل ٢٧٤.

(٣) الروضتین ج١ / ل ٥٨ ؛ العبر في خبر من غبر ، ج٤ / ل ١٨٧ .

(٤) الروضتین ،ج١ / ل ٥٨ ؛ سالم محمد حمیدة : الحروب الصلیبیة ،ج ٢ / ل ٥٨ ؛
Stevenson. The crusaders in the east .P. 166 .

(٥) الروضتین ، ج١ / ل ٥٨ .

(٦) لە الکامل، ج٧/ ل٧١: ب١ وەرگیراوە، هەروەها بڕوانە ( روضتین، ج ١/ ل٥٨ )
( ئەگەر فەرەنجەکان رزگاری و سەرکەوتنیان بەدەست هێنا
لە رۆژی یەغری و گەیشت بە هیوای سەرکەوتن
ئەوە تۆ لە جەنگی خطیم دا بێ باوەڕت لووت قرتاند و
راتکێشا لێیان (ابا المظفر ) مێرە شمشێری تیژی بندە )

(٧) الروضتین ، ج ١ / ل ٥٨ .

چوارەم

## شـــــەڕی بـــانـیــاس [1]

( ٥٥٢ك / ١١٥٧ز )

هۆکاری ئەم شـەرە دەگەڕێتـەوە بـۆ نا پـاکی خاچییـەکان لـە بەجێنـەهێنانی بەڵێنەکانیاندا، وەك بەڵێنەکەی ( بەلدوینی ) سێیەم ،کەدابووی بـــە خاوەن ئاژەڵـەکانی ئەو ناوچەیە، تـا لە لەوەڕگاکانی دەوری بانیاس بیانلەوەڕێنن ، بەڵام لە بەڵێنی خۆیـان پاشگەزبوونەوەو بەجێیان نەهێناو لە شوبات ساڵی ( ١١٥٧ز)ی بەرامبەر بـــە ذی الحجـەی ساڵی ( ٥٥١ك )ی پەلاماریاندان و ئەوی کوژرا ، کوژراو ئەوەیش مایـــەوە بـەدیل گرتیـان و دەستیان بەسەر مەڕو ماڵات و ئەسپەکانیاندا گرت [2]. نورەدین بەوە زۆر نیگەران بوو.

( ئیبن ئەبی طي) دەڵێت : خاچیەکان هێرشیان هێنایە سەر شاری حمص و حمـــاه .. ئەوەی دەستان گەیشتێ وێرانیان کرد [3] . دوای ئەم رووداو دەنگ و باسانە نورەدین لـە دیمەشق بوو ،لەگەڵ پێشەواو لەشکرەکانی تـردا بڕیاریـاندا،کـە هێرشـی ئـە مجارەیان گرتنی قەلاَی بانیاس و پەلاماردانی خاچیەکان بێت ، وەك سزایەك بەرانبەر بـەو کـارە ناهەموارانەی کردوویانە. بەڵام نورەدین ناچاربوو، کە بڕوات بۆ ( بەعەلبــەگ ) ،چونکـە لەو کاتەدا کێشـەیەك لـەنێوان کاربەدەسـتان و دانیشـتوانیدا دروسـت بوویـوو [4]، لـەو ماوەیەشدا شێرکۆ لەباکووری حەلەب ، پەلاماری پۆلێك لەســەبازی خاچیـەکانی دابـوو، لە پاشدا لە شاری بەعەلبەگ گەیشتە لای نورەدین و لەگەڵدا کۆبۆوە ، بڕیاری خۆ ئامـادە کردنیاندا بەرەو بانیاس و بەشێرکۆی راگـەیاند، بـەخۆیی و لەشـکرەکەیەوە لە پێشـەوە بڕۆن، وەك هێزێکی سوسەکردن (استطلاع) گەیشتنە بانیـاس و گـەمارۆیان دا. گرتیـان و پاشان بەدەستکەوتێکی زۆرەوە گەڕانەوە شوێنی خۆیان [5] .

---

(١) بانیاس : شاریکە لەبشتیوانەکانی شاری دیەشق و کەوتوتە هەرێمی سیهەمەوە (کتاب السـلوك ، ج ١ / ل٦٧)

(٢)ذیل تاریخ دمشق ، ل ٣٣٧ — ٣٣٨ ؛ الروضتین ، ج١ / ل ١٠٣ ؛ سعید عاشـور : الحرکـة الصلیبیة ، ج ٢ / ل ٦٦٧ .

(٣) لە الروضتین ، ج١ / ل ١٠٨ وە رگیراوە .

(٤) الکامل ،ج١ / ل ١٢٩ ؛ تتمة المختصر في اخبار البشر ، ج٢/ ل ٩٢ .

(٥) ذیل تاریخ دمشق ، ل ٣٣٩ — ٣٤٠ ؛ الروضتین ، ج١ / ل ١٠٧ ؛ الکواکب الدریة ، ل ١٥٤ ؛ رانسیمان : الحروب الصلیبیة ، ج٢ / ل ٥٥٢.

## پێنجەم

# شــەڕی مــەلـلاحـە

( ٥٥٢ ك / ١١٥٧ ز )

دوای گەڕانەوەی نورەدین مەحمود لەشەڕی بانیاس، ئاگادارکرا کەســەربازەکانی ( بەلدوینی ) سێیەم لەناوچەی مەللاحە ، ( کە دەکــەوێت نێوان شــاری بانیــاس و شــاری تەبەریەوە ) سەربازگەیان دامەزراندووە [١] . بۆیە وای بە باش زانی، کە دەســت پێشـخەری بکات بۆ سەریان پێش ئەوەی ئەوان دەست بوەشێنن ، بــۆ ئــەم مەبەســتەیش لــە ڕۆژی ٩ی مانگی جمادی یەکەمی ساڵی ( ٥٥٢ ك ) دا کە بەرامبەر بــە ١٩ی تشــرینی یەکــەمی ســاڵی ( ١١٥٧ز ) هێرشــی کــردە ســەریان و بــە نزیــك بوونــەوەی موسـلمانەکان لــە ســەربازگەی خاچیەکان سەربازەکانی ( بە لدوین ) خۆیــان کــردە چــوار تیــپ و هێرشــیان بــەرەو ڕووی موسڵمانەکان هێنا [٢] .

نورەدین مــەحمود و شــێرکۆو ســوارەکانی لەشـکری موسـوڵمانان لــە ئەسـپەکانیان دابــەزین و بریــاری خۆدامــەزراندنیان دا بــۆ بــەرگری کــردن لــەخۆیان، توانیــان بــە بەکارهێنانی تیرو کەوان و رم لەشکری خاچیەکان بەتەواوی تێك بشکێنن بە جۆرێــك کــە تەنیا ( دە ) کەسیان لێ ڕزگار بووبێ ، پاشا بەلەدوینی سێیەم ڕای کرد بۆ صەفەد [٣] .

لە لەشـکری موسـڵمانان دوو کـوژراو هــەبووە ، لــە ئــە نجامی ئــەم ســەرکەتنەیش لەشکرەکەی نورەدین تـاڵانیەکی زۆریان کەوتە بەر دەست و هــەندێ سەربازیشــیان بــەدیل گرت ،کە سێ تـا چوار کە سیان بەیەکەوە پــەت کرابــووە دەســتیان و هێنایــا ننــەوە بــۆ دیمەشق . ( ٤ ) . ( ئیبن ئەبی طي ) دەڵێت : شێرکۆ دیلەکانی بردووەتــەوە بــۆ دیمەشـق ، جارێکی تــر کۆمــەڵێك لــە خاچیــەکان هاتوونەتــە ســەر ڕێگــای و پــەلاماری شـێرکۆ و لەشکرەکەیان داون ، بەڵام ئــەم ســەرکردەیە توانیوێتــی بیــان بــەزێنێ و بەســەلامەتی بگەڕێتەوە بۆ دیمەشق [٥] .

---

(١) ذيل تاريخ دمشق ، ل ٣٤١ ؛ الروضتين ، ج ١ / ل ١٠٨ ؛ السيد الباز العريني : الحروب الصليبية ، ج ١ / ل ٦٠٧ .

(٢) رانسيمان : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل ٦٦٣ ؛ حسين مونس : نورالدين محمود ، ل ٢٦٤ .

(٣) ذيل تاريخ دمشق ، ل ٣٤١ – ٣٤٢ ؛ الكواكب الدورية ، ل ١٥٤ .

(٤) ذيل تاريخ دمشق ، ل ٣٤٢ .

(٥) لە الروضتين ،ل ١٠٨ وە رگیراوە .

## شـەشـەم

# شـــەڕی صـەیــدا [1]

## ( ٥٥٣ ك / ١١٥٨ز)

لە ساڵی ( ٥٥٣ ك / ١١٥٨ز) دا دەنگ و باس بڵاوبوەوە ،کە خاچیـەکان دەسـتیان کردووە بەگەمارۆدانی قەلاّی ( حارم ) و گرتوویانە، زیادەڕۆییان ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ لـە زیـاد بووندا بووە بۆ سەر خاکی موسـوڵمانان ،بەمەبەستی تـالانکردن و وێرانکردنـی. دیـارە ئەمەیش لـە ئـە نجامی سـەرقاڵی سەرلەشکرو ، سـەربازەکانی شـام بـووە بەنەخۆشـی نورەدینەوە .

نوەردین چاك بوەوەو کەوتە خۆ ئامادەکردن بۆ شەڕ. سەرەتا ڕووەو باشوور ڕۆیشـت لـە٧ی نیسانی ساڵی ( ١١٥٨ز/ ٥٥٣ك ) گەیشتە دیمەشق ، تاکو بیکاتە پاڵ پشـتی هێرشـەکان دژی هاوپەیمانانی خاچیەکان ، لەو کاتەیشدا هێرشیان هێنابووە سەر ناوچەکانی سـەر نزیك دیمەشق و کەوتبونە گـەمارۆدانی قـەلاّی ( داریـا ) لـە پشـت دیمەشـقەوە، بۆیـە نورەدین مەحمود بڕیای دا بەرەو ڕوویان بوەستێتەوەو هێرش بکاتە سەریان [2] ,

لەم کاتەدا شێرکۆ کـەوتبووە پـەلامار دانـی زەویـەکانی دەوری شـاری صـەیداو و دوایش هێرشی کردە سەر قەلاّی حوبەیس، کە خاچیەکان دروستیان کردبوو بـۆ خۆپارسـتن لە خۆیان لەسەر کەناری ڕووباری یەرموك ، ئەگەر بە زووی یارمـەتیان پـێ نەگەیشـتایە زۆری نەمابوو خۆیان بدەن بەدەست شێرکۆوە .

دواتر شێرکۆ بۆسەیەکی بۆ سـوارەو پیـادەی خاچیـەکان دانـاو لەهـەمان ناوچـەدا توانیان ژمارەیەکی زۆر لە سەربازی خاچیەکان بکوژن ، ئەوانەی کە مابوونـەوە بـە دیلـی بیان گرن، کە لەناویاندا کوری پێشەوای قەلاّی حارمی تێدابوو . پاشـان شـێرکۆ بەسـەر کەوتووی گەڕایەوە بۆ دیمەشق و دەسکەوتێکی زۆری لەگەڵ خـۆی هێنـا ، ئەمـە جگـە لـە ژمارەیەك دیل بەرانبەر کوژرانی یەك سەرباز لە لەشکرەکەی [3] .

---

(١) صەیدا : شارێکە لەسەر دەریا ، خاوەنی قەلا و شورایەکی قام بووە ، لەناوی ( صیدون کوری صدقا) وە ناونراوە صەیدا . (معجم البلدان، ج٣/ ل٤٢٧؛ ناصر خسرو: سفەرنامە ،ل ٤٩).

(٢) ذیل تاریخ دمشق ، ل ٣٥٠ – ٣٥١ : الروضتین ، ج١ / ل ١٢٠ ؛
Stevnson .The crusaders .P. 179

(٢) الروضتین ، ج١ / ل ١٢٠ .

## شــەڕی صــەیـــدا
( ٥٥٤ك / ١١٥٩ز)

دوای ئەوەی لەساڵی ( ٥٥٤ ك / ١١٥٩ز ) نورەدین مەحمود بۆ جاری دووەم نــەخۆش کەوتەوە . خاچیەکان بە بیستنی ئەم هەواڵە شادمان بوون و سەر لــەنوێ کەوتنــەوە خــۆ ئامادەکردنی سەربازی بە مەبەستی پەلامار دانی ناوچەی حۆران ، و لەم کاتەیشدا بــاری تەندورستی نورەدین بەرەو باشی دەچوو، لەلایــەکی ترەوە شێرکۆ بــۆ ســەردانی ( قوتبــە دین ) ی برای نورەدین چوو بوو بۆ موسڵ ، پــاش گەڕانــەوەی بــۆ شــاری حەلــەب ، شــێرکۆ بــەوەی زانی، کە نورەدین مەحمود نیازی سەردانی شاری دیمەشقی هەیە، تا لە نزیکـــەوە ئەنجامی ئەو خراپەکارییانەی خاچیەکان بزانێ، کــە لەناوچــەی حــۆران کردوویانــە، ، شێرکۆیش بووە هاوەڵی و لەگەڵیدا چوو بۆ شاری دیمەشق .

بەگەیشتنیان داوایان لەدانیشتوانی شاری دیمەشق کرد، کە خۆیان بــۆ شــەڕی خاچیەکان ئامادە بکەن ، پاشان شێرکۆ بڕیاری دا هێرش بکاتـــە ســەر هــەرێمی صــەیداو لەگەڵیشیدا ( نەجمەدین )ی برای و کوڕەکانیشی چوون و خاچیەکان پێیـــان نــەزانین، لــە ناکاودا کاری سەربازی خۆیـــان بەئــە نجام گــەیاندو زیــانێکی زۆریــان لەخاچیــەکان دا، ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و ژمارەیەکیشیان بــە دیــل گــرت ، جگــە لەتــاڵانییــەکی زۆرو بەهادار. لە دواییدا گـــەڕانەوە شــوێنی خۆیــان ئــەوەندەی تــر لەبــەرچاوی موسڵمانان گەورەتر بوون [1].

---

(١) الکامل ،ج ٧ / ل ١٤٤ ؛ الروضتین ،ج ١/ ل ١٢٣ ؛ مفرج الکروب ، ج١ / ل ١٣٠ ؛ الدواداري : کنز الدرر ، ج ٦ / ل ٥٦٩ .

هەشتەم

## هێرش بۆ سەر قەڵای داویە [1]

( ٥٦١ ك / ١١٦٥ ز )

دوای ڕێکەوتنی نێوان نورەدین و شێرکۆ بە مەبەستی پەلامار دانی قوللە و قەلای خاچیەکان لە ساڵی ( ٥٦١ ك / ١١٦٥ ز )دا ،نورەدین لەناکاو هێرشی بردە سەر لێژایی شاخەکانی لوبنان و پەلاماری قەلای ( منیطرة ) ی دا [2] ،کە بەدەست خاچیەکانەوە بوو، لەم هێرشەدا توانی لەماوەیەکی کەمدا دەست بگرێ بەسەریدا [3] .

هەر لەم کاتەیشدا شێرکۆ کەوتبووە پەلاماردانی ناوچەکانی پشت ڕووباری ئوردون ، لەناویاندا قەلای داویەی تێدا بوو ،کە لەناو ئەشکەوتێکی باشووری شاری عەمان بوو [4] ، دوای ئەوەی شێرکۆ ئەم قەلایەی گرت، ڕووی کردە قەلایەکی تر بە ناوی ( شەقیف ) [5] پاش ماوەیەك لە بەرنگاری خاچیەکاندا توانی ئەویش داگیر بکات ،کە ١٢ میل لەسەر بازگەی خاچیەکانی شاری ( صەیدا ) وە دوور بوو [6] ، دوای ئەویش هەڵمەتی بردە سەر قەلای ( غەراق ) [7] و دەستی بەسەر ئەویشدا گرت و بەم بۆنەیەشەوە ( عەرقەلە ) ی شاعیر ئەم چەند دێرە شیعرەی بۆ وتووە کە دەڵێت :

رحلت من الشقيف الى الغراق بعزم كالمهند الرقاق [8]

---

(١) کۆمەڵێك بووە لە سوارەی خاچیەکان لەساڵی ( ٥١٢ك / ١١١٨ ز ) دامەزرابوو پێشیان دەوترا سوارەی پەرستگا و ڕۆڵیشیان لە شەڕی خاچیەکاندا هەبوو . ( النجوم الزاهره ، ج٦ / ل٣٢ ؛ پ٢ ؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل١٨٨ ؛ پ٢ ) .

(٢) منيطرة : قەڵایەکە لە شام نزیك بەشاری تەرابلسە . ( معجم البلدان ، ج٥ / ل٢١٧ )

(٣) تاريخ الباهر ، ل١٣١ ؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل١٤٨ ؛ البداية و النهاية ، ج١٢ / ل٢٥١ .

(٤) السيد الباز العريني : الحروب الصليبية ، ج١ / ل٦٠١ ؛
Stevenson. The crusaders in the east. P. 191

(٥) شەقیف : قەڵایەکە کەوتۆتە نێوان مەعرەو شاری حەلەب . ( معجم البلدان ، ج٣ / ل٣٥٦ )

(٦) شفاء القلوب ، ل٣٢ ؛ السيد الباز العريني : الحروب الصليبية ، ج١ / ل ٦٠١ .

(٧) غەراق : قەڵایەکی قایم و پتەو بووە لە نزیك شاری بانیاس . ( معجم البلدان ، ج٤ / ل١٩٠ – ١٩١ )

(٨) ديوان عرقلة الكلبي ، ل٦٨
( تۆ ڕۆیشتیت لە شەقیفەوە بۆ غەراق بەتوانایەکی وەك شمشێرێکی تیژ )

## بـەشـی دووەم

## هـەڵمـەتە سەربـازییەکـانی شێرکۆ بۆ سەر میسر

### یـەکـەم

### بـاری رامیـاری میسر لـە پێش شێـرکـۆدا

لە سەدەی شەشی کۆچیدا ( دوازدەی زاینـی ) بـاری رامیـاری دەوڵـەتی فـا تمی لـە میسردا لەئەنجامی دەست بەکار بوونی چـەند خەلیفەیـەکی بـێ دەسـەلات و لاوازدا لەسـەر کاروباری وڵات تەواو شپرزە و شڵەژابوو ، کە مایەی سـەرهەڵدانی نـاکۆکی و ململانـێ بـوو ، لەسەر وەدەستهێنـانی پلەی وەزیری لەنێوان کاربەدەستانی دەوڵەتدا . خەلیفەش ئەو کەسـەی دەکردە وەزیر ، کە لەململانیەکەدا زاڵ دەبوو [1]، کار بەوحاڵە گەیشـت خەلیفـەکان لە پشـت پەردەوە بوون و وەزیرەکان دەت گوت ( شا ) ن بەتۆپزی بەسەر خەلیفـەکاندا فـەرمانڕەوابیان دەکرد ، خەلیفەکان بەجۆرێك بێ دەسەلات و لاواز بوون ئەوەی بۆیان مابووەوە، تەنها نـاز نـاو بوو ، بە وێنەی خەلیفەی عەبباسی لە بەغدا .

خەلیفە لە قەفەسدایە          لەنێوان وەصیف و بوغا
چی پێ دەڵێن دەیڵێتەوە          چەشنی گوتنەوەی تـوتی [2]

لەدوای کوژرانـی وەزیـر (ابـو الفضـل بـدر الجمـالي) ، لەسـاڵی ( ٥٢٤ ك / ١١٢٩ ز ) هەیبەت و شکۆمەندی خەلافەتی فاتمی زیاتر نەما ،چونکە لەو دەمەدا کەسیەتیەکی بەهێز و کارامە نەبوو ،لەو دەمەدا میسر بەرێوە ببـات [3] . ئـەم حاڵـەش خەلافـەتی فـا تمی بـەرەو هەرەسهێنان و نەمان برد ، چونکە لەدوای ئەم وەزیرەوە کەسێك نەدەبووە وەزیر ، ئەگـەر لـە ئەنجامی کوشتن و لـەناو چونـی وەزیرێکـی دی کـەدا نـەبوو بێـت، وەك کوشـتنی ( الفـزل ) بەدەستی( منمونی بەتـانحی ) و مەئمونیش بەدەستی ( احمدی کوری الفزل ) کوژرا ، بەم جۆرە تـا کۆتـایی بەفەرمانرەوایی فاتمیەکان هات، بەدەستی یەکتری دەکـوژران [4]. هـەموو سـەردەمی خەلیفەکان بەڵگەن بۆ ئەم باسە، وەك سـەردەمی خەلیفـە (الظـافر) سـاڵی ( ٥٤٤ — ٥٤٩ك / ١١٤٩ — ١١٥٤ ز ) ،کە ئیبن سالار بەکوشتنی ( ئەجمەدین کوری مصال ) هەڵساو خەلیفەش ( ئیـبن سالار )ی کردە وەزیر[5] ، ئەم بارە ناهەموارە کاری کردە سەر هەموولایەنێکی ژیان لـە میسـردا لە رووی بەرزبوونەوەی نرخی شمەك دا ، کەبووە هـۆی کەوتنـەوەی گرانـی لـە وڵات دا ، لـە ئەنجامدا برسێتی و نەخۆشی بلاو بووەوە لە نـاو زۆربـەی دانیشـتواندا لـەکاتێکدا خەلیفـەو دەست و پێوەندی نوقمی رابواردن و خۆشی ژیان بوون [6].

---

(١) الكامل ، ج٧ / ل١٠٢ . Stevunson. The crusaders. P. 178

(٢) قدري قلعچی: صلاح الدين، ل١٦١؛ ئەبەز مجيد امين: المشطوب الهكاري ، ل١١٨.

(٣) المنتظم ، ج١٠ / ل١٥ ؛ الكامل ، ج٧ / ل٦٢٧ ؛ حسن المحاضرة ، ج٢ / ل١٩ .

(٤) الكامل ، ج٧ / ل٧٦ — ٧٧ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٢١٥ ، ٢٢٨ ، ٢٤٦ ، ٢٦٣ .

(٥) الكامل ، ج٧ / ل٧٦ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٢٩٨ .

(٦) المقريزي : المواعظ و الاعتبار ، ج٢ / ل٢١٧ .

وەزیرەکانیش یارییان بە دارایی و سامانی دەوڵەتەوە دەکرد ، لە پێناو خۆبردنە پێشەوەو خۆ قایمکردنی زیاتر لەناو کۆشك دا [1] . لەناو ئەم لێشاوی برسێتی و قاتو قڕی و خوێن ڕشتنەدا ، (العاضید)ی برای خەلیفەی پێشوو کرایە خەلیفە، کە ئەو کاتە تەمەنی یازدە ساڵ بوو [2] ، (طلائع بن زريك الأرمني) ، کە وەزیری بوو ، کچەکەی خۆی لە خەلیفە مارەکرد ، تا زیاتر دەستی لە بەڕێوەبردنی حوکمدا گیر بکات [3]، لەئەنجامی دەست تێوەردانی زۆری لە کاروباری دەوڵەتدا ، پوری خەلیفە لەساڵی ( ٥٥٦ ك / ١١٦١ ز ) دا کوشتی و پاش خۆی رزیکی کوڕی خرایە شوێنی باوکی [4] ، شاوری صەعید والی شاری قوص لە رزیکی وەزیر ڕا پەڕی ، لە ئەنجامدا بەسەریدا سەرکەوت لەساڵی ( ٥٥٨ ك / ١١٦٣ ز ) دا کوشتی [5] و خەلیفەش شاوری کردە وەزیری خۆی . شاور زۆر بەناشرینی ڕەفتاری لەگەڵ خەلیفە ( عازید ) دا دەکرد ، جگە لەوەی ستەمی زۆری لەدانیشتوانی میسریش دەکرد ، بەمە میسری بەرەو لەناوچوون و هەڵدێر دەبرد [6] هەشت مانگ بەم جۆرە بەردەوام بوو ، تا چرغام کوڕی عامیر [7] لە صەعید لێی ڕا پەڕی و دانیشتوانی قاهیرەیش ئەم ڕاپەڕینەیان پێ خۆش بوو ، ناچار شاور دوای کوشتنی (طي) کوڕی [8] ،بۆ وڵاتی شام هەڵهات و پەنای بۆ نورەدین مەحمود برد [9] هەر لەم ساڵەدا ( ٥٥٨ ك / ١١٦٣ ز ) سێ کەس ئەم پۆستی وەزارەتەی لە قاهیرەدا وەرگرتووە ، کە ( عادل کوڕی رزیکی ئەرمەنی ، شاوری صەعیدی ، زرغام ) بوون [10] .

بەم جۆرە کار گەیشتە ئەوەی وەزیرەکان لەنێوان خۆیاندا دابەش بوبوون، هەیانبوو پەنای بۆ شام دەبردو داوای کۆمەکی سەربازی دەکرد، تیایاندا بوو ڕووی لە خاچیەکان دەنا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ناوخۆیان ، ئەمانەش دەبوونە هۆی پەردە هەڵماڵین لەسەر کەم دەسەڵاتی حوکمی میسر لەبەر چاوی هەردوولایاندا [11] .

---

(١) النجوم الزهيرة ، ج٥ / ل٣١٢ ، ٣٣٥ ؛ أحمد بيلى : صلاح الدين ، ل٨٢ .

(٢) الكامل ، ج ٧ / ل١٤٦ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣٣٤ .

(٣) الكامل ، ج ٧ / ل١٤٦ ؛ تتمة المختصر في اخبار البشر ، ج٢ / ل٩٧ .

(٤) الكامل ، ج٧ / ل١٥٧ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣١٤ ؛ شذرات ، ج٤ / ل١٧٧ .

(٥) الكامل ، ج٧ / ل١٦٦ ؛ الكواكب الدرية ، ل١٦٢ .

(٦) النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣٤٦ ؛ ابراهم الابياري : نهاية المطاف للدولة الفاطمية ، ل١٠٢ .

(٧) ضرغام : ئەبو ئەشبال کوڕی عامر کوڕی سوار منذري اللخمي یە پێشەوای میرەکانی بەرقیە بووە لە سەردەمی وەزارەتی صالح کوڕی رزیك دا . ( وفيات الاعيان ، ج٢ / ل٤٤٢ ) .

(٨) النوادر السلطانية ، ل٣٦ ؛ شفاء القلوب ، ل٢٥ .

(٩) النكت العصرية ، ل٨٠ ؛ سنا البرق الشامي ، ل٦٠ .

(١٠) الكامل ، ج٧ / ل١٦٦ ؛ و فيات الاعيان ، ج٢ / ل٤٤٤ .

(١١) مختصر تاريخ الدول ، ل٢١٢ ؛ ستانلي لينپول : سيرة القاهرة ، ل١٥٤ — ١٥٥ .

هەر لەم کاتەشدا ئەمالریك سالێك بوو تاجی شایانەی کردبووە سەر لە بەیتولمەقدیس دا ، چاوی بڕیبووە داگیرکردنی میسر، چونکە دەیزانی نورەدین مەحمود ڕێگەی پێنادات سنوری دەسەلاتی خۆی لە ولاتی شامدا فراوان بکات [1]. زەرغام یش کە پۆستی وەزارەتی وەرگرت ، سیاسەتێکی کورت بینانەی پەیڕەو دەکرد ، لەبەر ئەوە ولاتی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو شێواندن دەبرد ، بەو هەلانەی کەکردی لە کوشتنی هەموو ئەو سەرکردەو لایەنگرانەی سەر بە شاور بوون ، زیانێکی گەلێك گەورەی بە دام و دەزگاکانی دەولەت گەیاند، بەتایبەتی سەرکردایەتی سوپا، کەبووە مایەی لەدەست دەرچوونیان [2].

---

(١) سعيد عاشور : ميسر و الشام ، ل١٢ – ١٤ ؛ محمد علي الغتيت : الصراع بين الشرق و الغرب ، ل٤١؛ Stevenson. The crusaders. P. 185

(٢) الكامل ، ج٧ / ل١٦٧ ؛ الروضتين ، ج١ / ل١٦٥ ؛ المختصر في اخبارالبشر ، ج٥ / ل٥٦ .

دووەم

## یەکــەم هەڵمــەت

( ٥٥٩ ك / ١١٦٣ ز )

لە مانگی یەکەمی ساڵی ( ٥٥٨ ك / ١١٦٢ ز ) دا ، شاور وەزیــری لــەکار خــراوی میسر گەیشتە شاری دیمەشق [١] ، بە گەیشتنی بۆ شاری ( بصری ) نورەدین پــێی زانــی ، کۆمەڵێك لە پیاوە ناسراوەکانی شاری نارد بۆ پێشوازی کردنــی ، پــاش ڕێزێکــی زۆر بــۆ کۆشکی گۆڕەپانی سەوزیان برد لە دیمەشــق ، دوای حــەوت ڕۆژ لــە پشــوودان ، نورەدیــن نوێنەری خۆی نارده لایان ، تا لەگەڵیدا گفتوگۆ بکەن بەڵام شاور داوای کرد ، کە ڕاســتەو خۆ لەگەڵ نورەدین مەحمود دا گفتوگۆ بکــات ، نورەدیــن بڕیــاریدا لــە گۆڕەپــانی ســەوز لەگەڵیاندا کۆببێتەوە [٢] ، شاور لە کۆبوونەوەکەدا داوای لە نورەدین کــرد، تــا کۆمــەکی سەربازی پێ بدات بۆ گێڕانەوەی بۆ سەر کورسی وە زارەت لە میســردا [٣] ، بەرامبــەر بــەم هاریکارییە ، سێیەکی داهاتی میسری دەداتێ ، جگە لەبەخشینی زەوی بۆ ســەر لەشکر و سەربازە شامیەکان لە میسر [٤] ، لەگەڵ دابین کردنی خەرجی و پێداویستی هەڵمەتەکــە ، وە مانەوەی یەکێك وەك جێگری نورەدین لە قاهیرە [٥] .

سەرەتا نورەدین مەحمود لە بەجێ هێنانی خواست و داخوازییەکانی شــاور دوودڵ بوو ، چونکە لەوە دەترسا، کە هەڵمەتەکــە ســەرکەوتوو نــەبێت ، جگــە لــەوەی خۆشــی پێویستی زۆری بەسەرباز بوو ، سەرەڕای مەترسی ڕێگاویــان ، چونکە خاچیەکان دەســتیان بەســەردا گرتبــوو ، بــەڵام لــەدواییدا ڕازی بــوو بەکۆمــەك پێکردنــی شــاور، چونکــە داخوازییەکانی شاور لەگەڵ ئــاوات و ئارەزووەکــانی نورەدیــن لــە میســردا کــوك بــوون ، لــە پێناوی هێنانــەدی ئاما نجــەکانی لە پێکــهێنانی بەرەیــــەکی ئیســــلامی فــــراوان دژ بەخاچیەکان [٦] .

---

(١) النكت العصرية ، ل١٥٠ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣١٦ .

(٢) الروضتين ، ج١ / ل٣٦٥ ؛ شاكر احمد ابو بدر : الحروب الصليبية و الاسرة الزنكية ، ل٣١١ .

(٣) زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣١٦ ؛ الروضتين ، ج١ / ل٣٣٠ .

Stevenson. The crusaders. P. 186

(٤) تاريخ الباهر ، ل١٢٠ – ١٢١ ؛ رانسيمان : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل٥٩٤ .

(٥) زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣١٦ ؛ الروضتين ، ج١ / ل١٣٠ ، ١٦٥ ؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل١٣٨ ؛ ( ئیبن تەغری بەردی دەڵێت : " شاور بە نورەدین ی ووتووە کە وەك جێگرت دەبم لە میسردا ". ( النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣٤٦ – ٣٤٧ ) .

(٦) الكامل ، ج٧ / ل١٧٢ ؛ شفاء القلوب ، ل٣٦ ؛ نەبەز مجيد امين : المشطوب الهكاري ، ل٢١ ؛
Stevenson. The crusaders. P. 187
Champdor. Saladin. P. 30

هەر لـەم کاتەشـدا ، زرغـام بەدەسـتی ( عیلـم و لـەلیك کـوری نوحـاس ) دا نوسراوێکی رەسمی بۆ نورەدین نـارد، تیـایدا گـوێ ڕایـەڵی خـۆی پیشـان دەدات و داوای ریسوایی کردنی شاور دەکات . نورەدین مەحودیش ڕەزامەندی خۆی بەسـەر زارەکـی نیشـان داوەو بە نوسراویشی وەلامی زرغامی وەزیری میسری داوەتەوە ، بەلام لـە ژێـرەوە لەگـەڵ شاوردا بوو [1] .

هەرچۆنێك بێت نورەدین بڕیاری دا یارمەتی شاور بدات و شێرکۆی دەست نیشـان کرد، تا سەرکردایەتی ڕێکخستنی سوپا بگرێتە ئەستۆ چونکە ئازا و خۆ ڕاگر و کارامە بـوو ، هەروەها کارێکی پێ نە سپاردووە سەرکەوتنی تێدا بەدەسـت نـەهێنا بێـت [2] . لەبـەر ئەوە ناردی بەشوێن شێرکۆیدا نارد بۆ شاری رەحبە ، تـا بێتـە دیمەشـق و سـەرکردایەتی سوپای پێ بسپێرێت ، ئەویش خۆی بۆ ئـەو مەبەسـتە ئامـادە و ئـەیار بکـات و سـوپاش کۆبکاتەوە . شێرکۆ ( هەزار ) سواری لەگەڵ خۆی ئامادە کرد بێجگە لەسەر بـازی پیـادە و سەلاحەدینی برازای و شاور و لایەنگیرانی لەگەڵ خۆیدا برد [3] . نورەدین فەرمانی ئـەوەی بە شێرکۆ دا ، کە شاور بۆ سەر پلەو پایەی پێشووی بگێرێتـەوە و تۆڵـەش لـەو کەسـانە بکاتەوە ،کە لە وەزارەتدا دژیاتی دەکەن [4] .

شێرکۆ لە ڕۆژی پێنج شەممەی ڕێکەوتی بیستی جەمادی یەکەمی ساڵی ( ٥٥٩ ك / ١١٦٤ ز ) دا ، لە دیمەشقەوە بەرەو میسر بەڕێکەوت و لە ڕۆیشتنەکەیدا ڕێگـەی بیابانی گرتە بەر ، تا لەمەترسی خاچیەکان خۆی بەدوور بگرێت [5] . هاوکـات نورەدیـن مەحمود بەلەشکرەوە ڕووی لە بنکەی خاچیەکان کرد ، بەمەبەستی خەریك کردنیـان ، تـا ڕێگە لە هەڵمەتەکەی شێرکۆ نەگرن [6] .

---

(١) الروضتين، ج١ / ل١٦٥ – ١٦٦ ؛ (ئەشلێن یەحیا کوری عیلم ولەعلیك کوری نوحاس هاتووە بۆ شام) (خريدة القصر – قسم شعراء مصر ، ج٢ / ل١٢١ – ١٢٢ ) .

(٢) تاريخ الباهر، ل١٢١؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣١٦ ؛ الروضتين، ج١/ ل١٦٦؛ مختصر تاريخ الدول، ل٢١٣

(٣) النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣٤٧ – ٣٤٨ ؛ شذارات ، ج٤ / ل١٨٦ ؛ العبر في ديوان المبتدا والخبر ، ج٥ / ل٢٤٦ .

(٤) الكامل ، ج٧ / ل١٧٢ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣١٦ .

(٥) سنا البرق الشامي ، ل٦٠ ؛ الروضتين ، ج١ / ل١٣١ ؛ رانسيمان : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل٥٩٤ بەلام ابن شداد دەڵێت : ڕۆیشتنی شێرکۆ بۆ میسـر ساڵـی (٥٥٨ ك/ ١١٦٣ن) بـووە . ( النـوادر السلطانية ، ل٢٩)

(٦) الكامل ، ج٧ / ل١٧٢ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣١٦ . Stevenson. The crusaders. P. 187

ضرغام کە ئەم هەواڵەی پێ گەیشت ترسی لێ نیشت و بە ناچاری هاواری بۆ خاچییەکان برد و بەڵێنی بە شای قودس دا ، کە میسر دەخاتە بەر دەستیان ، ئەگەر دژ بە شاور یارمەتی بدەن [1] . بەڵام خێرایی شێرکۆ لە بزواندنی لەشکرەکەی و لێهاتوویی لە چارەسەر کردنی کاروباردا ، ئەو دەرفەت و هەلەی لەدەست زرغام سەندەوە ، بەوەی بەر لەهاتنی خاچییەکان ، شێرکۆ گەیشتە دەلتا [2] و لە شاری بلبیس نزیک بووەوە ، ناصرەدینی برای زرغام هاتە سەریان لەلای ( تەل بەستە ) ، بەڵام شێرکۆ لەشکرەکەی بەزاند و ناچاری کردن بگەڕێنەوە بۆ قاهیرە و شێرکۆش دووای لەشکری بەزیو کەوت ، لە کۆتایی مانگی جەمادادا لای قاهیرەوە چادرگەی هەڵدا . ضرغام یش لەو دەمەدا لەهەموو لەشکر و لایەنگرانی ، تەنها ( ٣٠ ) کەسی لەگەڵدا مابوو ، خۆی بێ کەس و بەبێ پشت و پەنا بینییەوە ، زرغام لەلای دیمەنی خاتوو ( نفیسە ) کوژراو دواتریش ناسرەدینی براشی بە کوشتن چوو [3] . وەزارەتەکەی زرغام تەنها ( نۆ ) مانگی خایاند [4] و شاور بەم جۆرە بۆ میسر گەڕایەوە و پلەی وەزارەتی گرتەوە دەست [5] ، ئەو دەمە کێشەیەکی نوێ و ململانێیەکی تازە لە نێوان شێرکۆ و شاوردا پەیدا بوو . شاور وای هەست دەکرد ، کە ئەو سەربەستیەی جارانی نامێنێ گەر شێرکۆ لە میسر بمێنێتەوە ، لە هەمان کاتدا شێرکۆ داوای هاتنە ناو شاری بۆ خۆی و لەشکرەکەی دەکرد ، تا لەژیانی ناو چادر و گەرمای بێزار کەر ڕزگاریان بێت ، بەڵام شاور بەمە قایل نەبوو و پشت گوێی خستن و تەنها ( ٣٠٠٠٠ ) دیناری بۆ شێرکۆ ناردو داوای لێ کرد بۆ شام بگەڕێتەوە [6] ، واتە ئەو بەڵێنانەی ، کە بە نورەدین مەحمودی دابوون ، لەبیر خۆی بردنەوە . بەڵام شێرکۆ ڕازی نەبوو بۆ شام بگەڕێتەوە ، تا شاور هەموو بەڵێنەکانی جێبەجێ نەکات .

---

(١) زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣١٧ : الروضتين ، ج١ / ل ١٣٠ .
(٢) الكامل ، ج٧ / ل١٧٢ : مفرج الكروب ، ج١ / ل١٣٨ : تتمة المختصر في اخبارالبشر ، ج٢ / ل١٠٤ : سعيد عاشور : الحركة الصليبية ، ج٢ / ل ٦٦٣ .
(٣) النكت العصرية ، ل١٢٤ : المنتظم ، ج١٠ / ل ٢٠٨ .
(٤) الروضتين ، ج١ / ل١٦٦ : النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣٤٧ .
(٥) الكامل ، ج٧ / ل١٧٣ : البداية و النهاية ، ج١٢ / ل٢٤٧ – ٢٤٨ .
(٦) تاريخ الباهر ، ل١٢١ : زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣١٦ – ٣١٧ ، الروضتين ، ج١ / ل٣٦٦ ؛Stevenson. The crusaders. P. 188

بۆیە شاور دەرگای قاهیرەی لە رویاندا داخست [1] ، شێرکۆ لەم رەفتارەی شاور زۆر تورە بوو ، لە تۆڵەی ئەم کردارەی شاوردا وای لە شێرکۆ کرد کە بڕیاری گرتنی شاری بلبیس ی دا [2] و نوسراوی بۆ نورەدین مەحود نارد ، تا لەڕوداوەکان بە ئاگا بێت [3] . لەم کاتەدا شاور ملی لە تاوانی گەورەتر نا ، نامەی بۆ شا ( ئەمالریکی ) خاچیەکان نارد ، تا بێت بە هانایەوە و لە دەست شێرکۆ رزگاری بکەن ، پارەیان چەند پێویست دەبێت نامادەیە بیان داتێ [4] ، ئەمالریك بەگەیشتنی نامەی شاور خۆشحاڵ بوو ، بەخێرایی داواکەی شاوری پەسەند کردو بە سەرکردایەتی خۆی بەلەشکری بەیت ولمقدیس و لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەوانەی بۆ سەردانی بەیت ولەقدیس هاتبوون ، لەگەڵ لەشکرەکەیدا بۆ سەر میسری هێنان لە ( فاقوسە ) بە شاور گەیشت، کە سەرکردەی لەشکری میسر بوو [5] . بەنزیك بوونەوەی لەشکری خاچیەکان و لەشکری میسر ، شێرکۆ و لەشکرەکەی لەشاری بلبیس دا خۆیان قایم کرد و کردیە پاڵپشت بۆ خۆی ، لەلایەن هەردوو لەشکری خاچیەکان و شاورەوە بۆ ماوەی ( سێ ) مانگ گەمارو دران [6] . نورەدین مەحودیش لە شام ، کەوتە پەلاماردانی بنکەو مۆڵگای خاچیەکان ، تا ناچاریان بکات لە میسر پاشە کشێ بکەن و گوشار لەسەر لەشکری شێرکۆ نەمێنێت .

هەواڵی نورەدین گەیشت ، کەوا دەستی بەسەر قەڵای ( حارم ) دا گرتووە و بەرەو ( بانیاس ) رۆیشتووە [7] ، هەر لەم دەمەدا ، نورەدین جەنگاوەرێکی خۆی بەکۆمەڵێك دروشم و کەل و پەلی دیل و گیراوە خاچیەکان لەشامەوە بۆ شێرکۆ نارد ، داوای لە جەنگاوەرەکەش کردبوو ، کە بە هەرشێوەیەك بێت دەبێت خۆی بەگەیێنێتە شێرکۆ لەناو شاری بەلبیس داو لەبازاڕو لەسەر شورای شارەکە کەلوپەلەکان پەرش و بلاوی بکاتەوە.

---

(١) تاريخ الباهر ، ل١٢١ : سنا البرق الشامي ، ل٦٠ :
.Stevenson. The crusaders. P. 188

(٢) النكت العصرية ، ل٧٨ : زبدة الحلب ، ج٢ / ل٢١٧ : الروضتين ، ج ١ / ل١٣١ : مفرج الكروب ، ج١ / ل١٤٠ .

(٣) الروضتين ، ج١ / ل١٦٧ : النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٢٤٧ .

(٤) الكامل ، ج٧ / ل١٧٣ : مراة الجنان ، ج٢ / ل٣٤١ .

(٥) النكت العصرية ، ل٧٨ : تاريخ الباهر ، ل١٢١ :
Stevenson. The crusaders. P. 188
Lane pool. A history of Egypt. P. 178
Cloud cahen. La syrie du nord. P. 410

(٦) الروضتين ، ج١ / ل١٣٢ : مفرج الكروب ، ج١ / ل١٤٠ : رانسيمان : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل٥٩٥ :
Crodsses. History des croisaders P. 454 – 455 .
Archer. The crusaders. P. 233
Lanepool . Saladin. P 83

(٧) زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣٢١ : الروضتين ، ج١ / ل١٦٦ – ١٦٧ :
Stevenson. The crusaders in the east. P. 190

بەگەیشتنی ، شێرکۆ دەستی بە جێبەجێ کردنی کرد ، ئەمە خاچیـەکانی تـوشـی دڵەڕاوکێ و نیگەرانیەکی زۆر کرد ، تـرسی وڵاتەکەیان لێ نیشت و داوایان لە شاور کرد بـۆ جیابوونەوە . لەئە نجامدا لەگەڵ شێرکۆ ڕێکەوتن ،کە هـەردوولا میسـر بەجێبـهێڵن [1] .
شێرکۆ لەبەرچاوی خاچیەکاندا زیاتر شـکۆ و بـەهای پـەیداکرد ، کـە بینیـان لـەکاتی دەرچوونی لەشکرەکەی لەشاری بلبیس بـەرەو شـام ، شـێرکۆ خـۆی بەتەورێکـەوە پشـتی لێگرتوون ئەمەش مایەی ڕاکێشانی سەرنجی دۆسـت و دوژمنـانی بـوو [2] . جگـە لـەوەی بەهۆی کارامەیی و پسپۆرییەوە لە ژیانی سەربازیدا ، توانی خـۆی و لەشکرەکەی لـەو بۆسەیەی خاچیەکان بۆیان نابووەوە دەرباز بکات ، لە گەڕانەوەی دا بۆشـام ، ئـەویش بـە گۆڕینی ڕێی گەڕانەوەیان [3] ، بەم بۆنەیەوە ( عمارة اليمني ) دەڵێت :

لئن نصبوا في البر جسرا فانكم  عبرتم ببحر من حديد على الجسر [4]

لە ٢٤ ذي الحجة دا گەڕایەوە بـۆ شـام ، ( ئیـبن زوبـیر ) بـەم بۆنەیـەوە ئـەم هۆنراوەیەی بەسەردا هەڵداوەو دەڵێت :

ليهنك حين استجمع النصر والفخر الـ  مجيد فلم يسمح بمثلهما الدهر
وهل يلبس الاظلام و الظلـم سـاعـة  اذا ما بدا من وجهك الشمس و البدر
ويخدمك الافرنج خـدمـة طاعـة  و ينفذ فيهم عندك النهي و الامر
و قبلك لم يسمع بـان خليفـة  يدين له الاسلام اجمع و الكفر [5]

لە کۆتاییدا دەڵێین :ڕاستـە ئـە نجامی ئـەم هەڵمەتـەی شـێرکۆ بۆسـەر میسـر ئامانجی خۆی نە پێکا ، وەك پێویست ، بەڵام شێرکۆ وەك سەرکردەیەکی سـەربازی سـوودی زۆری لێ بەدەست هێنا ، چونکە گرنگی و پڕ بایەخی و شـوێنی میسـر بـۆ دەرکـەوت و لـە حوکمە لاوازەکەشی دڵنیابوو [6] . هەر ئەم هۆکارانەش بوون پاڵیان بە شێرکۆوە دەنا، تـا بۆ جارێکی دی خۆی تەیار بکات .

---

(١) الكامل ، ج٧ / ل١٧٣ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣٢١ ؛ الروضتين ، ج١ / ل١٦٧ .
(٢) تاريخ الباهر ، ل١٢٢ ؛ الروضتين ، ج١ / ل١٣٢ ؛ شفاء القلوب ، ل٢٧ ، شذرات ، ج٤ / ل١٨٧ .
(٣) النوادر السلطانية ، ل٣٧ ؛ الكامل ، ج٧ / ل١٧٤ ؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل١٤٠ ؛ شفاء القلوب ، ل ٢٨
(٤) النكت العصرية ، ل٢٦٩ — ٢٧٠ ؛
( ئەگەر ئەوان توانیان لەوشکانیدا بۆسەیەکتان بۆ دابنێن  ئێوە دەتوانن بەناویدا بپەڕنەوە )
(٥) شفاء القلوب ، ل٢٨ ؛ ( پیرۆز بێت لێت کاتێك کۆ ئەبێتەوە سەرکەوتن و شانازی
شکۆدارە کە هەرگیز زەمانە بەو وێنەیە ڕێگەی نەداوە بۆ هیچ کەسێك
ئایا ڕێگەی ستەمکاری و تاریکی ئەمێنێتەوە
ساتێك کە دەرئەکەوێت لە ڕوخساری ڕۆژو مانگ
خزمەتکاریت ئەکات خاچیەکان خزمەتی گوێڕایەڵی
فەرمانەکانت تیایاندا جێبەجێ دەبێت
پێش تۆ هەرگیز نەبیستراوە کە خەلیفەیەك
ملکەچ بێت بۆی هەموو موسڵمانان و بێ باوەڕان )
(٦) النوادر السلطانية، ل٣٦ ؛ تاريخ الباهر، ل١٢١ ؛ پ٤ ، زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣٢٢ ؛ الروضتين، ج١/ ل١٣٢ .

### سێیەم

## دووەم هەڵمەت

( ٥٦٢ ك / ١١٦٦ — ١١٦٧ ز )

دوای گەڕانەوەی شێرکۆ لەیەکەم هەڵمەتی لە میسرەوە بۆ شام ، هەمیشە لە خولیای ئەوەدا بوو کە جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ میسر بۆیە لای ئەو کەسانەی کە جێی متمانەی بوون ، باسی لەوە دەکرد ، کە چۆن شاور تاوانی بەرامبەر کردووە [1] ، رق و کینە لە دەروونیدا جۆشی دەخوارد و نورەدینی بۆ هەڵمەتێکی دیکە هان دەدا لە هەمان کاتدا دەیزانی سەرکەوتن لەمیسردا دەبێتە باشترین یارمەتی دەری دژ بە خاچیەکان و میسریشی، وەك دەوڵەتێکی بێ حاکم دەهاتە پێش چاو .

لەم ساڵەدا بارودۆخەکە بە جۆرێك لواو و لەبار بوو ، پاڵی بە نورەدین مەحمودەوە نا کە ڕازی بێت ، چونکە نوسراوی خەلیفە ( عاضد ) ی پێ گەیشت ، کە تیایدا داوای بەهانا چوون و فریاکەوتن و ڕزگارکردنی لێدەکات لەدەست شاور ، کەهەر خەریکی ستەم کاری و خوێن ڕشتن و بەخشینی دارایی میسر بوو، لەگەڵ پێدانی زەوی و زار بە خاچیەکان ، جگە لەوەی کە شاور یەك دەستانە فەرمانڕەوایی میسری دەکرد و دەستی بەسەر کاروباری ولاتدا گرتبوو [2] .

نورەدین مەحمود لە دەرفەتێك دەگەڕا ، بۆی برەخسێت ، تا لەشکر بنێرێتەوە بۆ میسر ، لە مانگی بەهاری ساڵی ( ٥٦٢ ك بەرامبەر بە کۆتایی ساڵی ١١٦٦ ز ) ، ئەم دەرفەتە رەخساو ، نورەدین داوای لە شێرکۆ کرد، کە خۆی ئامادە بکات، بۆ دووەم هەڵمەت ئەم دەرفەتەش پاش تێپەڕبوونی سێ ساڵ بوو بەسەر یەکەم هەڵمەتدا [3] .

نورەدین لە ڕەفتارە نابەجێیەکانی شاور بەرامبەر بەشێرکۆ لەهەڵمەتی یەکەمدا داخ لە دڵ بوو [4]، لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ شێرکۆدا زۆر بەوردی و هۆشیارییەوە دەیانڕوانیە بارودۆخەکە، چونکە لەوە سڵیان دەکردەوە ،کە سامانی زۆری میسر هاندەر بێت کە خاچیەکان داگیری بکەن [5] جگە لەو هۆکارەی لەئارادا بوو، نورەدین و شێرکۆ بە ئاواتی پێکهێنانی بەرەیەکی ئیسلامی فراوان لەناوچەکە بەرامبەر بەخاچیەکان پێکبێت.

---

(١) النوادر السلطانية، ل٣٧؛ تاريخ الباهر، ل١٣٢؛ زبدة الحلب، ج٢ / ل٣٢٢؛ الروضتين، ج١/ ل١٤٢؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل١٤٨ .

(٢) مراة الزمان ، ج٢ / ق١ / ل٢٦٨ ؛ النجوم الزاهرة ، ج١ / ل٣٤٨ .

(٣) النوادر السلطانية ، ل٣٧ ؛ تاريخ الباهر ، ل١٣٢ .

(٤) الروضتين ، ج١ / ل١٣٢ ؛ شفاء القلوب ، ل٢٩ ؛

Stevenson. The crusaders in the east. P. 190 .

(٥) النوادر السلطانية ، ل٣٧؛ الروضتين، ج١/ ل١٤٢؛ دريد عبدالقادر: سياسة صلاح الدين، ل٧٧.

دەوڵەتی فاتمی لە میسردا کۆسپ بوو لەبەردەم وەدیهێنانی ئەم پرۆژەیەو مانەوەیان وەك هەڵگری ڕێباوەڕی (مذهب) شیعە لەناوچەکەدا ، زیاتر ڕێ خۆشکەری دوو بەرەکی و ڕێگر لەبەردەم پێکهێنانی ئەو بەرەیەدا بوو [1] . لەهەمان کاتیشدا شاور لەگەڵ خاچیەکاندا هاوپەیمان بوو [2] . شێرکۆ لەگەڵ (٢٠٠٠) سوار لە چاکترین جەنگاوەرەکانی خۆی خۆیان ئامادە کرد [3] . لەدۆڵی غەزلانەوە ڕێگەی بیابانیان گرتەبەر، تا خۆیان لە مەترسی خاچیەکان لەڕێگادا بپارێزن [4] . گەرماو گەردەلولی لاوی بیابان تووشی ناڕەحەتی زۆری کردن [5] لەگەڵ ئەوەشدا لای ئەتیفح [6] گەیشتە وڵاتی میسرو لە ڕووباری نیل بەرەو قاهیرە پەڕینەوە ، لەلای خۆرئاوای و لەجیزە لایاندا و ماوەی (٥٠) ڕۆژ مانەوە[7].

هەواڵ گەیشتە شاور ، بەخێرایی پەیوەندی بە خاچیەکانەوە کردو هاواری بۆ بردن ، تا بەفریای بکەون . ئەمالریکیش بە پەلە کەوتە خۆ ڕێکخستن بۆ داگیر کردنی میسر ، بەم گێڕانەوەیەش شێرکۆ پێش خاچیەکان گەیشتۆتە میسر [8] . ئەمالریك ، پێشەکی داوای نرخی ئەو کۆمەك کردنەی لە شاور کرد ، پێش بە کۆدا چونی شێرکۆ و دەرکردنی لە میسردا ، دەبێت شاور پەیمانێك مۆر بکات ، کە خەرجی هێرشەکەی بۆ قەرەبوو بکات و شاوریش بەڵێنی دا ، کە چوارسەد هەزار دیناری دەداتێ ، نیوەی پێش بە کۆداچوون و نیوەکەی دیکەی دوای شەڕەکە [9] .

---

(١) المنتظم ، ج١٠ / ل٢٣٧ ؛ ستانلي لينبول : سيرة القاهرة ، ل١٥٤ .

(٢) الكامل ، ج٧ / ل١٨٨ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣٢٢ ؛
Stevenson. The crusaders in the east. P. 191

(٣) الروضتين ، ج١ / ل١٦٧ ؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل١٤٨ ؛ شفاء القلوب ، ل٢٩ ؛ شذرات ، ج٤ / ل٢٠٢ ؛

(4) Stevenson. The crusaders in the east. P. 191

(٥) الكامل ، ج٧ / ل١٨٨ ؛ وفيات الاعيان ، ج٢ / ل٤٧٩ ؛ رانسيمان : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل٦٠٢ .

(٦) سنا البرق الشامي ، ل٦٢ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل ٣٢٢ ؛ شاكر احمد ابو بدر : الحروب الصليبية ، ل٣١٩ .

(٧) ئەتیفح : شوێنێکی دێرینە ، کەوتۆتە سەر کەناری خۆرهەڵاتی نیل ، (٤٠) میل لە باشوری قاهیرەوە دوورە . (معجم البلدان ، ج١ / ل٢١٨) . النكت العصرية ، ل٨٠ ؛ الكامل ، ج٧ / ل١٨٨ ؛ مراة الزمان ، ج٨ / ق١ / ل٢٦٨ .

(٨) تاريخ الباهر ، ل١٣٢ ؛ النوادر السلطانية ، ل ٣٧ ؛ تتمة المختصر في اخبار البشر ، ج٢ / ل١١١ . هەروەها دەڵێن پێکەوە گەیشتوونەتە میسر . ( شفاء القلوب ، ل٢٩ )

(٩) النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣٤٨ ؛ شفاء القلوب ، ل٢٩ ؛ السيد الباز العريني : الحروب الصليبية ، ج١ / ل٦٣٦ ؛ رانسيمان : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل٦٠٣ .

شایانی باسه كه ئەم ڕێكەوتنە وای پیشان دەدا ، كه داگیر كردنی میسر لەلایەن خاچیەكانەوە بەكارێكی میسری نیشـان دەدا ،كـه ئـەوان پارێزگـاری میسـرو خەلافـەتی فاتمین . لە پێناوی ئەوەی ئەم دەرفەتە لەدەست موسوڵمانان دەرنەچێت ،شێركۆ نوێنـەری خۆی بۆ لای شاور ناردو سوێندی بۆ خوارد بوو، كه له میسردا نامێنێتەوەو جارێكی دیكـەش بۆی ناگەڕێتەوە ، ئەگەر لەشكری شام و میسر ببنە یەك لەشكر دژ بە خاچیەكان و تا ئـەم هەلە لەدەست نەدرێ و خوێنی موسـڵمانان بەدەسـتی موسـڵمانان نـەڕژێت . بـەلام شـاور نوێنەری شێركۆی كوشت ، دواتریش خاچیـەكانی لـەناوەڕۆكی نامەكـەی شـێركۆ ئاگـادار كردەوە [1] . ئەمالریك خەریكی پەڕینەوە بوو له ڕووباری نیل، تا لەگەڵ لەشكری شاور دا پێكەوە پەلاماری شێركۆ بدەن ، كەلەبەری خۆرئاوای ڕووبارەكـەدا هـەڵی دابـوو ، بـەلام شێركۆ زوو بەم جموجۆڵەی زانی ، بەهۆی هەواڵ هەڵگرەوە [2] . شایانی باسه كـه زانیـاری كۆ كردنەوە پێویسترین كاره بۆ سوپای جەنگاوەرو بـەتایبەتی لەناو خاكی دوژمنـدا ،بـۆ كۆ كردنەوەی زانیاری تایبەت بە دوژمن له ڕووی ژمارەو ـ چەك ـ و شوێن [3] .

شێركۆ هەستی بەمەترسی هەڵوێستەكه كرد، ناچار ئەو جێگەیەی بەجێهێشت و ڕووی لە صعید كرد ، هـێزی هـەردوولا شـوێنی كـەوتن ، تـانزیك شـاری ئـەشمونێن [4] ، لەشكرەكەی شێركۆ لە سوارە پێك هاتبوون، بەلام لەشكری خاچیەكان كەمیان سوارە بـوون و لە شكری میسریە كانیش زۆربەیان پیادەبوون [5] زۆری ژمارە ی خاچیەكان و میسـریەكان ، پاڵی بە شێركۆ وە نا، تا وتوێژ لەگەڵ میر و سەركردەكانی لە شكرەكەیدا بكات ،

شێركۆ بەردەوام جەختی لەسەر شەڕكردن دەكـردەوە سـووربوو لەسـەری ، بـەلام زۆربەی میرەكانی لەوە ئاگاداریان دەكردەوە ، كـه شەڕەكـە ئـەنجامی خراپـی دەبێـت ، چونكە لەشكرەكەیان بەژمارە كەمن و لە ولاتیشەوە دوورن و هیچ جێیـەكی خۆپاراسـتن و خۆ دەربازبونیان نیە.

---

(١) الروضتين ، ج١ / ل ١٦٨ ؛ اتعاظ الحنفا ، ج ٣ / ل ٢٨٣ ؛ السيد الباز العريني : الحروب الصليبية ،ج ١ / ل ٦٧٨؛ ب٤، رانسيمان: الحروب الصليبية، ج٢ / ل٦٠٣ .

(٢) الكامل ، ج٧/ل ١٨٩ ؛ الروضتين ، ج١ / ل ١٤٣ ، ١٦٧ .

(٣) ئەبەز مجيدامين : الاستخبارات الايوبيه في عهد صلاح الدين ، ل ١٢٨ .

(٤) ئەشمونێن: شارێكی بچووك وئاوەدانه ، له بەشی باكووری ڕووباری نیلە . (صورة الارض ، ل١٤٨ ؛ معجم البلدان ، ج ١ / ل ٢٠٠)

(٥) الكامل ، ج٧ / ل ١٨٩ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل ٣٢٢ ؛ مفرج الكروب ، ج١/ ل ١٤٨ ؛Stevenson. The crusaders in the east. P. 191

هەروەها میرەکان دەیانگوت : " هەرچی لەم وولاتەدایە لەسەر بـاز و جووتیـار دوژمنمانە " لەبەر ئەوە گەرانەوە بۆ شام باشـترە ، بـەلام یـەك لـە میرەکـان کـە مـیر ( شەرەفەدین برغەش ) بوو هەستاو گووتی : " کێ لە کوشتن و زامدار بوون دەترسێت ؟ بـۆی هەیە بگەڕێتەوە ناومالی خۆی و ئیتر خزمـەتی نورەدیـن مـەحمود نـەکات" . شـێرکۆش گووتی : " ئەوە راوبۆچوونی منیشـەو کـاری پێدەکـەم" (١) لـە راسـتیدا شـێرکۆ بـۆ ئـەو مەبەستە سوپاکەی بردبووە بەشی خۆرئـاوای نیـل ، تـابزانن کـە ئـەوێ تەنـها ڕێگـای سەرکەوتنە بەسەر دوژمنانداو لـە جـەمادی یەکـەم و نیسـانی سـالی ( ٥٦٢ ك / ١١٦٧ز ) شـەڕی ئەلبابەین روویدا.

بەلام خاچیەکان نەخشەکەیان بەم جۆرە دارشت ، لەشکری میسـر لای چـەپ و ، لەشکری خاچیەکان لای راسـت بـن و هـەرچی ئـەمالریك یشـە لـەناو جەرگـەدا بـوو(٢) .

سەبارەت بەو نەخشەیەش کە شێرکۆ بۆ شەڕەکەی دانابوو چەند بۆچوونێك و تـێروانینێکی جوداواز هەن ، لەوانە ( ئیبن تەغری بەردی ) دەلێت : " شـێرکۆ خـۆی لـەناو جەرگـەدا و سەلاحەدین لای راست و میرە کوردەکانیش لای چە پیان گرتبـوو " (٣) . بـەلام ئیـبن ئـەثیر دەلیت : " شێرکۆ شارەزای چوونیەتی شەری خاچیەکان بوو بوو ، کە بەزۆری شالاو دەگەنـە سەر ناوجەرگەی لەشکر ، لەبەرئەوە سەلاحەدینی داناو لەوە ئاگاداری کردەوە ، کـە فێـل بەکار بهێنن و بەراستی شەر نەکەن و لەبەر دەم دوژمندا پاشەکشێ بەرەو دواوە بکەن ، تـا بەتەواوی دواتان دەکەون ، کۆمەلێك جەنگاوەری ئازاو خۆراگریشی لای راست دانا " .

بۆچوونەکەی شێرکۆ هاتـەدی وەك چـۆن نەخشـەی بـۆ کێشـابوو، لە پشـتەوە هێرشیان بۆ خاچیەکان بردوو شکستیان پێ هێنـان (٤) . بەلام ( ئیبن ئەبی تـەی ) دەلێـت : شێرکۆ لەشکرەکەی کرد بەدوو بەشەوە بەشێکی دایەدەست سەلاحەدین، کە لە پشتەوە بێـت ، بەشەکەی تری لای خۆی بوو پاشان دەلێت : " دوای هێرشی دوژمن بـۆ سـەر شێرکـۆ لـە دواوە بەشەکەی دی، کە سەلاحەدین سەرکردەیان بوو ، پەلاماری دوژمنی داوەو بـەم جـۆرە لە پێش و پاشەوە پەلاماری لەشکری خاچیەکان و میسریەکانیان داوە " (٥) .

---

(١) الروضتين ، ج ١ / ل ١٤٣ ، ١٦٨ .

(٢) مراة الزمان ، ج ٨ / ق ١ / ل ٢٦٨ — ٢٦٩ : زبدة الحلب ، ج ٢ / ل ٣٢٣ ؛ النجوم الزاهيرة ،ج ٥ /ل ٣٤٨ .

(٣) النجوم الزاهرة ،ج ٥ / ل ٣٤٩ .

(٤) الكامل ، ج٧ / ل ١٨٨ ؛ هەروەها بڕوانە Lanepoole : saladien . p. 89 .

(٥) لە الروضتين ، ج١ / ل ١٦٨ وەرگیراوە .

وه ( سبط بن الجـوزي ) يـش دەڵێـت : " شـێركۆ خـۆی لـەناو جەرگـەدا بـووە سەلاحەدینیشی لەلای ڕاست و میرە کوردەکانیشی لای چەپ داناوە [1] ، بەهــەر شـێوەیەك بێت ، ئەوەندەی نەمابوو ئەمالریك خۆیشی بــەدیل بگـیرێ [2] و ژمارەیـەکی زۆر کـوژراو و برینداریان بووە ( ٣ ) و نزیکەی سەدو حەفتا سەربازی خاچیەکان بــەدیل گـیران [4]. بـەم شێوەیە ، لەشکری شێرکۆ ســەرەڕای زۆری و گـەورەیی سـوپای خاچیـەکان و میسـرییەکان توانی بیانبەزێنێت. مێژوونوسی فەرەنسی ( میشۆد ) دەڵێت : " ئەم سەرکەوتنە بەڵگەیە بـۆ لێهاتوویی و شارەزایی شێرکۆ لە بەڕێوەبردنی کاروباری جەنگدا بەسەرکەوتوویی " [5].

هەروەها ( ئیبن ئەثیر ) دەڵێت : " ئەم سەرکەوتنەی شێرکۆ لەبەرچاو مێـژوودا ، زۆر سەرنج ڕاکێش و جێی سەرسوڕمان بووە ، چـۆن دوو هــەزار سـوار دەتوانـن ، لەشـکری میسرو خاچیەکانی کەنار ببەزێنن و بەسەرکەوتنێکی گەلێك مەزن لەقەڵــەم دراوە " [6] و شانازییەکی گەورە بووە بۆ ئەو میرانەی کە لەم شەڕەدا شەرەفی بەشدار بوونیان بــووە [7]. دواتر شێرکۆ ڕووی‌کردە شاری ئەسکەندەرییە ولەوێ خەڵکی شار بەگەرمیەوە بــەرەو پـیری هاتن وپێشوازییان لێ کرد، لە بێ‌دەسەڵاتی فەرمانڕەوایانی میسر ، بێزارییان پیشـانداو بڕیاری هاوکاری کردنیان بەشێرکۆ و لەشـکرەکەی دا [8] ، شـێرکۆ ،ئەسکەندەرییەی بـە جێهێشت و سەلاحەدینی لەوێ لەگەڵ ( ٥٠٠ ) جەنگاوە ر دانا و خۆی ڕووی لەشاری ( صعیــد ) کرد [9].

---

(١) مراة الزمان ، ج٨ / ق ١ / ل ٢٦٨ – ٢٦٩ .

(٢) الروضتين . ج١ / ل ١٦٨ ؛ شاكر احمد ابو بدر : الحروب الصليبية والاسرة الزنكيه ، ل ٣٢٣ .

(٣) تاريخ الباهر ،ل ١٣٣ ؛ العبر في خبر من غبر ، ج ٤ / ل ١٧٦ ؛ مراة الجنان . ج ٣ / ل ٣٧٠ .

(٤) مراة الزمان . ج ٨ / ق١ / ل ٢٦٨ – ٢٦٩ ؛ النجوم الزاهـرة ، ج ٥ / ل ٣٤٩ . (ئـەبو شـامە دەڵێـت: ژمارەی دیلەکان ٧٠ دیل بووە) (الروضتين، ج١ / ل١٦٨) .

(٥) لە احمدبللي: صلاح الدين ، ل ٨٨ وەرگیراو .

(٦) الكامل ، ج ٧ /ل ١٨٩ ؛ هەروەها بڕوانە،
Lanepoole . A history of Egypt .p. 177 – 179

(٧) ئەبەز مجيد امين : المشطوب الهكاري ، ل ١٣١ .

(٨) تاريخ الباهر، ل١٣٣؛ سنا البرق الشامي، ل ١٦٤؛ مراة الزمان ، ج ٨ / ق١ / ل ٢٦٩؛ الكواكب الدرية ، ل١٧١.

(٩) زبدة الحلب ، ج٢ / ل ٣٢٣ – ٣٢٤ ؛ الروضتين ، ج١ / ل ١٦٨ ؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل ١٥١ .
Stevenson. The crusades in the east. P. 191

هەرچی ئەمالریك و شاوریشە لەدوای بەزینیان لەشەڕی بابەین دا، پاش ماوەی لەشکرەکەیان بەرەو قاهیرە گێڕایەوە تا سەرلەنوێ لەشکرەکانیان رێك بخەنەوە پاش ئەوەی خۆیان ئامادەو کۆکردەوە ، بەرەو شاری ئەسکەندەرییە هاتن و گەمارۆیان دا بە درێژایی سێ مانگ [1] . دانیشتوانی ئەسکەندەرییە ، جوامێرانە بەرەنگای لەشکری شاور و خاچیەکان بوونەتەوە لەکاتی گەمارۆ بوونەکەدا . هەرچەندە بۆ چوونێکی دیکەش هەیە ، دەڵێت: شێرکۆ هەرلەوێ بووە، بەڵام کە زانیویەتی خۆراك بەرەو کەم بوونەوە دەچێت ، سەلاحەدینی بەجێ هێشتووەو خۆی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە لەشکرەکە بەشەو دزەیان کردووەو لەشارچوونەتە دەرێ بەرەو شاری صعید بۆ پارە کۆکردنەوە [2] .

سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە ئەمالریك زۆر تورە بووەو ویستویەتی دوای بکەوێت، بەڵام شاور داوای لێ کردووە وازی لێ بهێنێت [3]. سەلاحەدین گوشاری زۆر بۆ هات و ناچار داوای یارمەتی و کۆمەکی لە مامی کرد، شێرکۆش صەعیدی بەجێ هێشت و بەهاواریانەوە هات. لەئەنجامدا :" نوێنەری خاچی و میسریەکان هاتنە لای شێرکۆ و داوای رێککەوتنیان کرد" [4]

بۆچوونێکی دیکە دەڵێت : شێرکۆ کە گەڕایەوە بۆ شاری ئەسکەندەرییە بۆ فریاکەوتن بەهانای سەلاحەدینەوە ، یەکێك لە دیلە خاچیەکان کەناوی ( ئەرنۆلف ) بوو وەفەرمانڕەوای تەل باشر [5] بوو نارد بۆ سەربازگەی ئەمالریك ، تا پێیان رابگەیەنێت، کە شێرکۆ داوای رێککەوتن دەکات [6] ، ئەمالریك خێرا رازی بوو ، چونکە زەویەکانیان لە شامدا بەر هێرش و شاڵاو کەوتبوو لە لایەن نورەدینەوە [7] ، وە بریار لەسەر ئەوە درا، کە هەردوو لایان میسر چۆڵ بکەن . شاور بری ( ٥٠,٠٠٠ ) دینار بداتە شێرکۆ ، جگە لەوەی کۆی کردبوە وە ، شێرکۆش داوای کرد ، شاور نابێت ئازاری کەس بدات بەناوی ئەوەی هاریکاری لە شکری شامیان کردووە ، ئەمالریك مەرجەکانی پەسەند کرد ، هەروەها دەستیان بە گۆڕینەوەی دیلەکان کرد [8] .

---

(١) النكت العصرية ، ل ٨٠ ؛ الكامل ، ج ٧ / ل ١٩٠ ؛ شفاء القلوب ، ل ٣٠ ؛ ( گوتراویشە گەمارۆکە چوار مانگی پێ چووە ) (مراة الجنان ) ، ج٣ / ل ٣٧٠ .

(٢) الروضتين ، ج ١ / ل ١٤٥ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل ٣٤٩ .

(٣) تاريخ الباهر ،ل ١٣٣ ؛ مفرج الكروب ، ج ١ / ل ١٥١ ؛ الكواكب الدرية ، ل ١٧١ ؛ Stevenson. The crusaders in the east. P. 191

(٤) الكامل ، ج٧ / ل١٩٠ ؛ وفيات الاعيان ، ج ٢ / ل ٤٧٩ ؛ النجوم الزاهرة، ج٥ / ل٣٤٩ .

(٥) تەل باشر: قەڵایەکی قایمە لە باکوری شاری حەلەب . (معجم البلدان، ج٢ /ل٤٠ ).

(٦) رانسيمان : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل٦٠٦ ؛ السيد الباز العريني : الحروب الصليبية ، ج ١ / ل ٦٨٤ .

(٧) زبدة الحلب ، ج٢ / ل ٣٢٤ ؛ مفرج الكروب ، ج ١ / ل ١٥٢ ؛ النجوم الزاهرة ، ج ٥ / ل٣٤٩ ؛
Stevenson. The crusaders in the east. P. 191
Archer:. The crusaders P. 235.

(٨) تاريخ الباهر ، ل ١٣٤ ؛ زبدة الحلب ، ج ٢ / ل ٣٢٤ ؛ الروضتين ، ج١ / ل ١٦٩ ؛ مراة الجنان ، ج٣ / ل ٣٧٠ .

شێرکۆ بۆ شام گەڕایەوەو لە ١٨ی ژیلقەعدەی ساڵی (٥٦٢ ك) بەرامبەر بە ئەیلولی (١١٦٧ز) دا گەیشتەوە دیمەشق [١] بەڵام ئەمالریك لەسەر دەستکەوتی دارایی و مافی چاودێری و سەرپشك بوون پێی داگرتبوو، وەداوی ئەوەی ئەکرد هێزێك جێ دەهێڵێت و نوێنەرێکی باڵایان لە قاهیرە دەبێت و ساڵانە باجی (سەد) هەزار دیناری بەشێوەیەکی هەمیشەیی دەبێت بدرێت بەخاچیەکان [٢] ئەمالریك بۆ فەلەستین گەڕایەوە [٣].

دەرئەنجامی هەڵمەتی ئە مجارەی شێرکۆ لەوەدا بوو، زیاتر شارەزای ژیانی رامیاری میسر بوو، لەگەورەو تا بچووك دەیزانی کە ئەوکارو کردەوانەی لەوڵاتدا روو دەدەن خەلیفەی فاتمی لێیان بێ ئاگایەو شاور بەرپرسیاری سەرەکیە لەهەمووی، وە لە هەمان کاتدا ئەوەشی بۆ ئاشکرابوو، کە میسر سوپایەکی بەهێزیان نیە، تا پارێزگاری خۆی بکات، لەبەرئەوە شێرکۆ کۆڵی ئەداو سووربوو لەسەر گەڕانەوەو دەست بەسەردا گرتنی [٤].

بەبۆنەی گەڕانەوەی شێرکۆ بۆ دیمەشق، (عماد)ی نووسەر (الکاتب) ئەم پارچە هۆنراوەیەی بەسەردا هەڵداوە لەژێر کاریگەری ئازایەتی و خۆڕاگری شێرکۆدا لەبەرەکانی شەڕدا بەرامبەر بە دوژمن، دەڵێت:

بلغت بالجد مالا يبلغ البشر ... ونلت ماعجزت عن نيله القدر
من يهتدي للذي أنت اهتديت له ... ومن له مثل ما اثرته اثر
أسرت أم بسراك الارض قد طويت ... فأنت اسكندر في السير أم خضر
تنا قلت ذكرك الدنيا فليس لها ... الا حديثك ما بين الورى سمر
فأنت من زانت الايام سيرته ... و زاد فوق الذي جاء ت به السير [٥]

---

(١) النكت العصرية، ل ٨٠ : الكامل، ج ٧ / ل ١٩٠ : الروضتين، ج١ / ل ١٦٩.
(٢) تاريخ الباهر، ل ١٣٤ : الروضتين، ج ١/ ل ١٦٩ : كارل بروكلمان :تاريخ الشعوب الاسلامية، ل ٣٥١ ;
Lane poole : Saladien .p . 91
Archer .. The crusaders. P. 236.
(٣) النجوم الزاهرة، ج٥ / ل ٣٥٠؛ الروضتين، ج١ / ل ١٤٤ ؛ رانسيمان : الحروب الصليبية، ج٢ / ل ٦٠٧
(٤) الروضتين، ج ١ / ل ١٥٤.
(٥) الروضتين، ج١ / ل ١٤٥

(بەکۆششی زۆرت گەیشتووی بە پلەیەك کە مرۆڤ پێی ناگات
پلەیەکت بەدەست هێناوە کە قەدەر بەدەستی ناهێنێ
کێ ئەتوانێ ئەو رێگەیە ببڕێت و بگاتە ئەوەی تۆ پێی گەیویت
کێ جێ دەستی دیارە وەك جێ دەستی تۆ
ئایا تۆ رۆیشتی یان زەمین پێچرایەوە بە رۆشتنەکەت
بەڕاستی تۆ اسکندەری لە رۆیشتندا یان (خضر)ی زندەی
هەموو جیهان باسی تۆ ئەکات و شەو بە تۆ بەسەر ئەبات
وە هیچ کارێك و دەنگ و باسێك نیە باسی تۆ نەبێت
تۆ ئەو کەسەی کە رەوشتت رۆژکاری جوان و رازاوە کردووە
وەزیاتری هێناوە لەو دەنگوباسەی کە ژیاننامەی کەسانیتر هێناویانە)

### چـــوارەم

## سـێـیـەم هـەڵـمـەتـی سـەربـازی

**( ٥٦٤ ك / ١١٦٨ز)**

خاچیەکان لە ڕێی ئـەو کۆشـش و تەقەلایانـەی، کـە لـە پێناوی داگـیرکردنی میسردا دابوویان ، بەتەواوی لەوە دڵنیا بوون ، کە وڵاتی میسر هێزێکی ئـەو تـۆی تێـدا نییە ، کە بتوانێت بەر پەچیان بداتەوەو بەر هەڵستیان بکات [١] .

خاچیەکان لەوە گەیشتبوون ، کە خەلیفەی فاتمیەکان زۆر بێ دەسـتەڵاتە ، وە شوێنی میسر گرنگەو بایەخدارەو داهات و سامانی چەندە؟ ئەمانـەیان لا ئاشکرابوو ، وە بە بەردەوامی لەڕێی ئەو هێزەی کە لەساڵی ( ٥٦٢ ك / ١١٦٧ز) دا لـە قاهـیرە بـەجێیان هێشتبوو هەواڵ و ئاگاداریـیان پێ دەگەیشت [٢] ، ئـەو هـێزە بـەئارەزووی خـۆی هـەڵس و کەوتی دەکردو، بە زۆردارەکی فەرمانڕەوایی میسری دەکردوو ، جگە لەوەی کـە بوویـوونـە مایەی نارەحەتی و ئازاردانی دانیشتوانی قاهیرەو نیگەرانیان ، هـەروەها پـەیتا پـەیتا نوسراویان بەرێ دەکرد بۆ ئەمالریك ی پاشایان ، تا بێت و میسر بگرێت .

هەرچەندە هەندێك لە پیاوماقوڵانی میسریش لە رقی شاور لایەنگیری و پشـتگیری خۆیان بۆ خاچیەکان دەربڕی بوو، پـەیوەندییان بـە شـا ئەمالریکـەوە کردبـوو[٣]. سـەرەتا ئەمالریك داوای هاوپەیمانی کرد، لەگەڵ ( مانویل ) ی ئیمـپراتۆری بیزەنتـەو ولیـەم صـوری وەك نوێنەری ( بیت المقدس ) بۆ ( قسـتەنتینیە ) نـارد بـۆ ئـەو مەبەسـتە، کـە هـەردووکیان پەلاماری میسر بدەن و داگیری بکەن [٤] ، پاشان ئەمالریك لە پێناو گرتنی میسردا لە بەیت و لمەقدیس، ئە نجومەنی کۆکردەوە ، تا راوبۆچوونی هەمولایەك ببیستێ. سەرەتا شا ئەمالریك گوتی: من وای بەباش دەزانم، کە لەشکرکێشی بۆ سەر میسر نەکەین، چونکە خۆراکی خۆمانەو داهاتەکەی ساڵانە بۆخۆمان دێت و خۆی پێ بـەهێز دەکـەین دژ بـەنورەدین مـەحمود . دیـارە ئەگەر هێرش بەرینە سەر میسر فەرمانڕەواو سەربازو جوتیارەکـانیش دژمـان دەوەسـتن و دوور نییە بیدەنە دەست نورەدین مەحمود ، ئەگەر شـێرکۆش فـەرمانڕەوای بێـت ، ئـەوا بێگومـان لەناوچوون و فەوتانمان نزیك دەبێت و لە شامیش وەدەرمان دەنێت [٥]

---

(١) سنا البرق الشامي ، ل ٧٢ – ٧٤ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل ٣٥٠ ؛ ابن طبا طبا : الفخري في الاداب السلطانية ، ل ٢٦٣ .

(٢) تاريخ الباهر ، ل ١٣٧ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل ٣٢٦ ؛ مفرج الكروب ، ج ١ / ل ١٥٦ ؛ ستانلي لينبول : سيرة القاهرة ، ل ١٥٦ .

(٣) الروضتين ،ج ١ / ل ١٥٤ ؛ شفاء القلوب ، ل ٣٢ ؛ لەو پیاو ماقولانە وەك : ابن خياط ، ابن قرجله ، ملك النحاس ( الروضتين ، ج١ / ل ١٧٠ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل ٣٥٠ ) .

(٤) سعيد عاشور : مصر والشام ، ل ١٩ ؛ دريد عبدالقادر : سیاسة سەلاحەدین ، ل ٨٢ ؛ .Stevenson The crusaders in the east. P. 193

(٥) تاريخ الباهر ، ل ١٣٧ ؛ الروضتين ، ج ١ / ل ١٤٥ ؛ مفرج الكروب ، ج١ /ل ١٥٦ ؛ تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج ١ / ل ١٩؛ سعيد عاشور : الحركة الصليبية ، ج ٢ / ل ٦٦١ .

هـەر لـەم کۆبوونەوەیـەدا ( جیلـبرتی ) پێشـەوای ئیسـبتاریەکان[1] پـێی لەسـەر پەلاماردانی میسر دادەگرت و ( بارونات )ی عیلمانیـەکانیش پشـتگیری بـۆ چوونکـەیان دەکـرد ، هەرچی گروپی داوییەکان بوو ، رازی نەبوون لەسەر پەلاماردانی میسرو گوتیان : "ئێمە بەشداری ناکەین" [2]، بەڵام هەندێك هۆکاری لاوەکی بوونە هاندەر بۆ خاچیەکان ، تا بە پەلە پـەلاماری میسر بدەن ، لەو هۆکارانە ، گوایا شاور لەگەڵ هێزی خاچیەکاندا هەڵس و کەوت و رەفتاری چاك نەبووە ئەو باجەی ،کە ساڵانە دەیدا بەخاچیەکان دوای خستبوو ، لە پـاڵ بڵاوبوونـەوەی دەنگـو باسی ژن و ژنخوازی سەلاحەدین لەکچی شاور لە لایەك و خواستنی خوشکی سەلاحەدین بـۆ کـوڕی شاور لەلایەکی دیکەوە ، کە بوونەمایەی پـەیداکردنی مەترسـی لای ئـەمالریك ، جگـە لـەوەی ژمارەیەك لەخەڵکی ئەوروپا ،کە بەشداربوون لە پێناو دەستکەوت و تاڵانیدا [3] .

لەبەرئەوە ئەمالریك بریاری هێرش بردنی دا ، چونکە دەی گوت : " شاور لاوازەو جێـی متمانەو دڵنیاییمان نییە ".

لەبەرئـەوە لـە ١٥ ی موحـەرەمی سـاڵی ( ٥٦٤ ك ) ای تـەموز ( ١١٦٨ ز ) دا پـەلاماری میسریدا[4]. هەرچەندە ئەمالریك ، وای بڵاوکردەوە،کە پەلاماری شاری ( حمص ) دەدات ، ئەمـەش بۆ ئەوە بوو تا نورەدین هێرش نەکاتە سەر میسر[5]، کاتێك شاور بەخۆی زانی سوپای خاچیـەکان لەشاری عەسقەلان دەرچووبوون . شاور بەخێرایی میر ( بەدران ) ی بـۆ سـەر سـنوور نـارد ، بـەڵام ئەمالریك ڕازی کرد [6] و بەردەوام بوو لەسەر بەرەو پێـش چوونـی لەشـکرەکەی بـۆ نـاو میسـرو بەنزیك بوونەوەی لەشاری بلبیس شاور نوێنەرێکی دیکەی بـەناوی ( شـەمس ولخەلافـە ) وە نـارد بۆلای ئەمالریك ، داوای هۆکاری هاتنی خۆی و لەشکرەکەی لێ کرد . ئەمالریك لە وەڵامدا ، باسی شووکردنی کچی شاور بۆ سەلاحەدین و هاتنی خەڵکانێکی زۆر لە ئەوروپاوە بۆ گرتنی میسـری بـۆ شەمس ولخەلافە کرد[7]، وە هاتنی خۆشی بۆ بەربەست کردن و ڕوونەدانی کێشـە و شـەرکرد ، تـا بەرگری لێ بکات ، لە پاڵیدا داوای ( یـەك ) ملیـۆن دینـاری لەنوێنـەری شـاور کـرد، دواتـر بـە لەشکرەکەیەوە لەیەکی سەفەری ساڵی ( ٥٦٤ ك/ ١١٦٨ز ) ڕووی لەشاری بەلبیس کرد.

---

(١) ئیسبتاریەکان : گروپێکی ئایینی چەکداربوون، بەسوارەی قەدیس یۆحـەننا ناسـرابوون لـە سـاڵی (٤٩٢ ك / ١٠٩٩ ز ) دامـەزراوە . سەرەتا چارەسـەری نەخۆشـیان دەکـرد دواتـر بوونـە جـەنگاوەری خاچیەکان . ( محمد سهیل طقوشي: تاریخ الایوبیون ، ل٢٤ ؛ پ٢ )

(٢) الکامل ، ج٧ / ل١٩٦ ؛ رانسیمان : الحروب الصلیبیة . ج ٢ / ل٦١٣ – ٦١٤ .

(٣) الروضتین ، ج١ / ل١٧٠ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣٥٠ ؛ تاریخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل٢٠ ؛ شاکر أحمد ابو بدر : الحروب الصلیبیة و الاسرة الزنکیة ، ل٣٢٩ .

(٤) تاریخ الباهر ، ل١٣٧ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣٢٦ ؛ Stevenson. The crusaders in the east. P. 193

(٥) الکامل ، ج٧ / ل١٩٦ ؛ الروضتین ، ج١ / ل١٥٤ ؛ رانسیمان : الحروب الصلیبیة ، ج٢ / ل٦١٤ .

(٦) ئەمارلیك توانی بەدران ڕازی بکات بەرامبـەر بـە ( ١٣ ) گوند ، بەمـەرجێك کـە گەڕایـەوە بۆ لای شـاور پێی بڵێت هاتنی ئەمالریك بۆ خزمەتکردنە . ( الروضتین ، ج١ / ل١٧٠ ) .

(٧) الروضتین ، ج١ / ل١٧٠ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣٥٠ ؛ تاریخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل٢٠ .

شاور تێگەیشت ، کە مەبەستی خاچیەکان داگیرکردنی میسرە ، لەبەرئەوە بە خێرایی کەوتە خۆ ئامادە کردن و رێکخستنی لەشکرو بەشێکی بۆ شاری بلبیس نارد ، بۆ بەرگری کردن . ئەمالریك ئەوەی بەخەیاڵیدا نەهاتبێت ئەوەیە. کە شاور بەلەشکرەکەیەوە بەرنگاری ببێتەوە . شاری بلبیس بۆ ماوەی ( سێ ) رۆژ توانی بەرگری بکات ، بەلام دواجار خاچیەکان توانیان بچنە ناو شارەکەوەو کوشتن و برینێکی ئەوتۆیان تێدا کرد، قەسابخانەیەك بوو بۆ خۆی ، سامان و ماڵێکی زۆریان بەتالان برد، لەم زەرەرو زیانەدا ( قیبتیەکانیش ) وەك موسڵمانەکان بێبەش نەبوون [1] ، هاوکات لەگەڵ ئەم رووداوە هێزی دەریایی خاچیەکان ، پەلاماری شاری ( تەنیس ) یان دا [2] و هاوشێوەی شاری بلبیس هەمان قەسابخانە بەرامبەر بەخەڵکەکەی کراو شارەکەشیان تالان کرد.

ئەمالریك دوای تالانکردنی بلبیس، بریاری رووکردنە شاری (فسطاط) دا، کە دەکەوێتە باشوری شاری قاهیرەوە ، شاور بەگومان بوو لەوەی ،کە لەشکرەکەی لە توانایاندا بێت بەرگری لە شاری فوستات بکەن و گەیشتە ئەو باوەرەی، کە شارەکە چۆڵ بکرێت و بسوتێنرێت . ئەوەبوو لە شەشی سەفەری ساڵی ( ٥٦٤ ك / ١١٦٨ ز ) دا شارەکە سوتێنرا بۆ ماوەی ( ٥٤ ) رۆژ سوتانەکە بەردەوام بوو ، و لەکاتی چۆڵکردنی شارەکەدا، خەڵکەکە لەحاڵێکدا بوون دەتگوت رۆژی حەشرەو تازە لەگۆڕ وەدەرهاتون و کەس تەماشای کەسی دیکەی نەدەکرد [4] .

لەناو جەنجاڵی ئەم رووداوە پڕ مەترسیدارانەدا خەلیفەی فاتمی (عاضد) ، کەسی دەست نەدەکەوت ،تا هانای بەرێتە بەرو لەم مەترسییە رزگاریان بکات ، نورەدین مەحمود نەبێت . لەبەرئەوە بەخێرایی نووسراوی بۆ نووسی و تیایدا داوای بەهانا هاتن و فریاکەوتنی لێ دەکات ،باسی بێ توانایی هێزی میسریان لەبەردەم سوپای خاچیەکاندا بۆ دەکات و لەگەڵ نووسراوەکەدا " چەند کلافەیەك لە پرچی ژنانی تێدا ناردبوو" ، وە ئەوەی تیادا روون کردبووەوە ، کە ئەمە پرچی ژنانی کۆشکی خۆمە و هاواریان بۆ تۆ هێناوە ، کە لەدەست درێژی خاچیەکان بیانپارێزیت و رزگاریان بکەیت.

---

(١) النكت العصرية ، ل٨٠ ؛ تاريخ الباهر ، ل١٣٨ ؛ سنا البرق الشامي ، ل٧٤ ؛ الكواكب الدرية ، ل١٧٥ ؛ Stevenson. The Crusaders. P. 193

(٢) تەنیس : لە شێوەی دورگەدایە لەناو میسردا ، لە وشکانیەوە لە دمیاط نزیکە . ( معجم البلدان ، ج٢ / ل٥١ ) دانیشتوانەکەی بەناوبانگ بوون بەرستن و چنینی جلوبەرگی سوڵتانەکان . (ناصر خسرو : سفر نامە ، ل٧٦ ) .

(٣) العبر في خبر من غبر ، ج٤ / ل١٨٤ — ١٨٥ ؛ مراة الجنان ، ج٣ / ل٣٧١ ؛ رانسیمان : الحروب الصليبية ، ج٢ /ل٦١٦

(٤) الكامل ، ج٧ / ل١٩٧ ؛ الروضتين ، ج١ / ل١٧٠؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣٥٠ ؛ نەبەز مجيد امين : المشطوب الهكاري ، ل١٢٤ ؛ Lanepoole. Saladien. P. 93

خەلیفە، ئەمەی کرد، تا غیرەت و جوامێری نوردەدین بهێنێتە جۆش، تەنانەت لە دەقی نامەکەیدا دەڵێت: " هەی هاوار بەفریای ئایینی ئیسلام بکەومو بەهانای ئومەتی موحەمەدەوە وەرە ، ئەی ڕوناکی ئایین " [1] پاشان ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە سێیەکی داهاتی وڵاتی میسر بۆ نورەدین دەبێت و شێرکۆش لە میسر بمێنێتەوەو، نوسراویشی بۆ هەمان مەبەست بۆ شێرکۆ ناردبوو [2]. ( ابن الفرات ) دەڵێت: " شەمس ولخەلافە بە ( کامیل )ی کوڕی شاوری گووتووە، کە بچێتە لای خەلیفە (عاضد)، تا نامە بۆ نورەدین بنوسێت " [3]. بۆچوونێکی دیکە دەڵێت " شاور نامەی بۆ نورەدین مەحمود ناردووەو داوای یارمەتی لێکردووە" [4].

هەرچی ( ولیەم صوری ) مێژوونوسی خاچیەکانە. بەرپەرچی ئەوە دەداتەوە، کە شاور داوای یارمەتی لە نورەدین کردبێت و دەڵێت: " ئەمە لەهەڵبەستنی خاچیەکان بووە " [5]

هەرچۆنێك بووبێت بەگەیشتنی نامەکە بەنورەدین مەحمود زۆر دڵگران بوو، بە خێرایی بەدوای شێرکۆیدا نارد بۆ شاری حمص ، هەرچەندە شێرکۆ خۆی ڕوومو حەڵەب دەهات [6]. هاتنی بەخێرایی شێرکۆ، مایەی خۆشحاڵی نورەدین بووو بە پەلە داوای لە شێرکۆ کرد کە لەشکری پێویست ئامادە بکات و ( ٢٠٠ ٠٠٠ ) دوو سەد هەزار دینارو پۆشاکی پێویست لەگەڵ ( ٢٠٠٠ ) دوو هەزار سواری پێدا . شێرکۆ توانی ژمارەی لەشکرەکەی بگەیەنێتە ( ٨٠٠٠ ) هەشت هەزار سوار لەگەڵ ژمارەیەك لە باشترین میرەکانی سوپا .

نورەدین لەکاتی بەڕێ کردنی لەشکردا ، هەر سەربازەو ( بیست ) دیناری پێدان و لەگەڵ شێرکۆدا خۆشی کەوتە ڕێ لە بۆ بەڕێ کردنی.

---

(١) النكت العصرية ، ل٨٠ ؛ تاريخ الباهر ، ل١٣٨ ؛ سنا البرق الشامي ، ل٧٥ ؛ الروضتين ، ج١ / ل١٥٤ — ١٥٥ .

(٢) الكامل ، ج٧ / ل١٩٨ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣٢٦ ؛ المختصر في اخبار البشر ، ج٣ / ل٤٥ ؛ شفاء القلوب ، ل٢٤ ؛ حسن المحاضرة ، ج٢ / ل٢٠ .

(٣) تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل٢٢ .

(٤) النوادر السلطانية ، ل٣٨ — ٣٩ ؛ شفاء القلوب ، ل٣٢ ؛ ( ئیبن تەغری بەردی دەڵێت : بە فەرمانی عازید شاور نوسراوی ناردووە) (النجوم الزاهرة ، ج٥/ ل٣٥٠) ؛ (المقريزي)یش بەجۆرێکیتر دەیگێڕێتەوە دەڵێت: شاور داوای لە عاضد کردووە نامە بنوسێت ( اتعاظ الحنفاء ، ج٣ / ل٢٩٣ ).

(٥) لە السيد الباز العريني: الحروب الصليبية، ج١ / ل٦٩٤؛ پ٤، وەرگیراوە .

(ئەبو شامە) ش دەڵێت : شەمس و لخەلافە بە کامیلی کوڕی شاوری ووتووە باوکت نامە نانوسێت بۆ نورەدین ( الروضتين ، ج١ / ل١٧٠ )

(٦)الكامل ، ج٧ / ل١٩٨ ؛ زبدة الحلب ، ج ٢ / ل٣٢٦ ؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل١٥٨ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣٥٠ ؛ حسن ابراهيم حسن : الدولة الفاطمية ، ل١٩٣ — ١٩٤ .

ئەوەی شایانی باسە شێرکۆ ، هەمان ڕێگای پێشووی گرتەبەر لەچوونیدا بۆ میسر [1]، لەم کاتەدا لە قاهیرە ، شاور هەرخەریکی فێڵ کردن و لەخشتە بردنی ئەمالریك بوو، کە لە نزیك شاری قاهیرەوە سەربازگەی دامەزراندبوو، داوای ملیۆنێك دیناری دەکرد . شاور ( ١٠٠ ٠٠٠ ) سەد هەزار دیناری پێشەکی بۆ برد و داوای پاشەکشەی لێ کردبوو ، تا بواری بۆ برەخسێت ، باقی پارەکەی بۆ گرد بکاتەوە [2] .

لەگەڵ گەیشتنی هەواڵی لەشکری شێرکۆو بڵاوبوونەوەی، ئەمالریك، لە ڕووبەڕووبونەوەی لەشکری شێرکۆ لەناو میسردا ترسا ، ناچار بڕیاری دا بگەڕێتەوە بۆ ( بیت المقدس ) دا [3]، هەرچەندە بیری بۆ ئەوەش چوو، کە لەڕێگا پەلاماری لەشکری شێرکۆ بدات ، پێش ئەوەی لەگەڵ لەشکری میسردا تێکەڵ بن ، بەلام ئەمالریك ئەم نەخشەیەی سەر نەگرت و ئەوەبوو بۆ فەلەستین گەڕایەوە [4] .

شێرکۆ ساڵی ( ٥٦٤ ك / ١١٦٨ ز ) هاتە ناو شاری قاهیرەوە . دانیشتوانی قاهیرە بەم هاتنە زۆر دڵخۆش و شادمان بوون و پێشوازیەکی شایستەو گونجاویان لێ کردو بەچاوی پاڵەوانێکی ڕزگارکەرەوە تێیان دەڕوانی، تەنانەت خەلیفە ( عازید ) یش بەم هاتنە زۆر خۆشحاڵ بووو دیاری بەبەهاو بەنرخی بۆ ناردو ژمارەیەك گەورە پیاوانی کۆشکی بۆ خزمەت کردنی نارد [5] .

خەلیفە هەر خۆشی بە شەوو بەنهێنی سەردانی شێرکۆی کردو لەسەر گەلێك شت پێکهاتن، کە لەناویاندا کوشتن و لەناوبردنی شاوریش یەکیان بوو [6]. بەلام ( ئیبن ئەلعەدیم ) دەڵێت : " شێرکۆ خۆی چوو بۆ کۆشك بۆلای خەلیفەو خەلیفە زۆر ڕێزی لێ گرتووە " و شاوریش هەردەم ڕق و کینەی خۆی دەخواردەوە [7] .

---

(١) الكامل ، ج٧ / ل١٩٨ ؛ النوادر السلطانية ، ل٣٨ ـ ٣٩ ؛ سنا البرق الشامي ، ل٧٦ ؛ الكواكب الدرية ، ل١٧٦؛
Stevenson. The Crusaders in the east. P. 194
Lanepoole. Saladien. P. 95
نورەدین لە پێش شێرکۆوە ، شەرعزان عیسا هەکاری نارد بۆ میسر ، بە دوو نامەوە ، نامەیەکیان نهێنی بوو بۆ خەلیفە دەربارەی شاور ، ئەویتریان بۆ شاور بوو سەبارەت بەهاتنی شێرکۆو یارمەتی دانی لەشکری میسر دژ بە خاچیەکان . (الروضتين ، ج١ / ل١٧٠) .

(٢) الكامل ، ج٧ / ل١٩٧ ؛ وفيات الاعيان ، ج٢ / ل٤٤٧ ؛ شذرات ، ج٤ / ل٢١١ ؛
Stevenson. The Crusaders in the east. P. 193

(٣) النكت العصرية ، ل٨٠ ؛ تاريخ الباهر ، ل١٣٩ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣٢٧ ؛
Stevenson. The Crusaders in the east. P. 194

(٤) الكامل ، ج٧ / ل١٩٨ ؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل١٦٠ – ١٦١ ؛ مرآة الجنان ، ج٣ / ل٣٧٤ .

(٥) تاريخ الباهر ، ل١٣٩ ؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل١٦١ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣٥١ ؛ سيرة اعلام النبلاء ، ج١٢ / ل٢٠٢ ؛

(٦) الروضتين ، ج١ / ل١٧١ .

(٧) زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣٢٧ .

لەلایەکی دی کەوە شاور بە بەردەوامی سەردانی شێرکۆی دەکرد بــە هیــوای لــە خشتە بردن و خەڵاتـاندنی بوو ، تـالە کۆتـاییدا شاور بڕیاریدا بــە پیلانێـك ،کـە سـازی کردبوو ، شێرکۆ و میرەکانی شام ، گشتیان بۆ ئاهەنگێکی نـــان خــواردن بـانگهێشـت بکـاو لەوێدا لەناویان بەرێت . کاملی کوڕی شاور بەسازدانی ئەم ئاهەنگە و ئە نجامەکەی زانـــی ، بڕیاری سەرنەگرتنی ئەم ناپاکییەی دا ، کە دەبوو لەو ئاهەنگــەدا بکرێـت [1] . دواتــر میرو سەر لەشکرەکان لەگەڵ شێرکۆ کۆبونـــەوەو ئاگاداریــان کــردەوە ، لــەوەی کــە شــاور هۆکاری ســـەرئە نجامی خرا پەکارییــەکانی ئــەم وڵاتەیــە و داوای کوشـتنیان کــرد ، تــا موسڵمانان لە بەڵاو شەڕ خوازییەکانی بەدوور بن و ڕزگاریان بێت [2] .

شێرکۆ لە ترسی ئەوەی ئەوەکا ئاژاوە دروست ببێت و ئەوەی بەدەستیان کـەوتووە لە دەستیان دەربچێت ، ئەی دەویست شاور بکوژرێت ، لەبەر ئەوە عیسا هەکاری [3] بــۆ لای شاور نارد و داوای لێ کرد ، کە وریا بێت و خەرجیش بداتــە لەشـکری شــام ، بــەڵام شــاور گوێی بەم ئامۆژگارییانە نەداو ڕۆژانە سەردانی شێرکۆی دەکــرد [4] . ڕۆژێــك ، شـێرکۆ بــۆ سەردانی گۆڕی ئیمامی شافیعی قاهیرە چوو بوو ، شاور بۆ ســەردانی هــات . ســەلاحەدینی برازای و عیزەدین جردیك ئەم هاتنەی شاور و نـــەبوونی مــامی ، بــە دەرفــەتیان زانــی و بڕیاریاندا خۆی لێ ڕزگار بکەن و ئەم هەلە لەدەســت نــەدەن . پــەلاماریان داو دایــان بــە زەویدا و پەلبەستیان کرد [5] و شــێرکۆیان لێ ئاگــادار کــرد و ، خەلیفــە عــازیدیش بــە بیستنی ڕوداوەکە داوای سەری شاوری کرد .

---

(١) الکامل ، ج٧/ ل١٩٩ ؛ الروضتین ، ج١ / ل١٥٧: المختصر في اخبار البشر ، ج٣ / ل٤٥.

(٢) تاریخ الباهر ، ل١٤٠ ؛ الروضتین ، ج١ / ل١٥٧ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣٥٢ ؛ شفاء القلوب ، ل٣٤

(٣) نــاوی ( ضیــاء الدیــن عســی هــەکاری ) یــە ، پیاوماقوڵ و بــەتوانا بــووە ، لــە پێشـینەکانی ســوپای ئەسەدییە بووە ، شەرعزان بووە ، سەرباز بووە ، ئازا بووە ، ئیمامی سەربازەکانی شێرکۆ بووە ، لە ساڵی ( ٥٨٥ ك / ١٦٨٩ ز ) دا مردووە .

( وفیات الاعیان ، ج٣ / ل٤٩٧ ) ؛ بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە : ئەبەز مجید ئــەمین : عیسـی هــەکاری ، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی ، ژمارە (٧) ساڵی ٢٠٠١ .

(٤) النکت العصریة ، ل٨١ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣٢٧ ؛ الروضتین ، ج١ / ل١٥٨ .

(٥) تاریخ الباهر ، ل١٤٠ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣٥٢ .

دواتر شێرکۆ بڕیاری داو کوشتیان [1] بە پێی فەرمانی خەلیفە عازیدی فاتمی لە ساڵی ( ٥٦٤ ك /١١٦٨ ز ) دا [2] و دواتر خەلیفە عازید پاش ماوەیەکی کەم لە چواری جەمادی کۆتایی ساڵی ( ٥٦٤ ك ) بەرامبەر بەهەژدەی یەنایری ( ١١٦٩ ز ) ی کامیلی کوڕی شاورو طاري برای کامیل و خوشکەزاکانی کوشتن [3] .

عیماد الکاتب ووتوویەتی :

من شر شاور انقذت العباد فكم — وكم قضيت لحزب الله من ارب
هو الذي اطمع الافرنج في بلد الاسلام — حتى سعوا للقصد و الطلب [4]

ئەمەش هۆنراوەیەکی عەرقەلەی کەلبی یە ، کە دەڵێت :

لقد فاز بالملك العقيم خليفة — له شيركوه العاضدي وزير
هو الاسد الضاري الذي جل خطبه — و شاور كلب للرجال عقور
بغى و طغى حتى لقد قال قائل — على مثلها كان اللعين يدور
فلا رحم الرحمن تربة قبره — ولا ازال فيها منكر ونكير [5]

---

(١) تهذيب تاريخ دمشق الكبير ، ج٦ / ل٣٦٠ ؛ خريدة القصر ، ج١ / ل١٣ ؛ مرآة الزمان ، ج٨ / ق١ / ل٢٧٧ .

(٢) تاريخ الباهر ، ل١٤٠ ؛ زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣٢٨ ؛ الروضتين ، ج١ / ل١٥٧ ؛ مختصر تاريخ الدول ، ل٢١٢ ؛ هاملتون جب : سەلاحەدین ، ل١١٩ ؛ ارنست باركر : الحروب الصليبية ، ل١٦١ .

(٣) الكامل ، ج٧/ ل٢٠٠ ؛ وفيات الاعيان ، ج ٢ / ل٤٤٨ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣٥٢. الروضتين ، ج١ / ل١٥٩ ،

(٤) لە شەڕی شاور خەڵکانت ڕزگارکرد — زۆر پێویستیت بۆ حیزبانی خوا جێبەجێ کرد
شاور : ئەو کەسە بوو کە خاچییەکانی هاندا بۆ گرتنی وڵاتی ئیسلام بەشێوەیەکی وا کە هاتن بۆ مەبەستیان و ویستیان )

(٥) ديوان عرقلة الكلبي ، ل٥٢ :
( بەڕاستی بەدەستی هێنا موڵکی خاوەن تەختی بێ میراتگر
پاشایەك کە شێرکۆ پشتگیرو وەزیری ئەوە
شێرکۆ ئەو شێرە نەڕەیە کە باسی گەورەیەو کاری گرنگە
شاوریش ئەو سەگە ئەهێنی گەرەیە کە خەڵکان ئەگرێت
شاور گومڕابوو وەزۆرداربوو هەتا یەکێك ووتوویەتی
شەیتان بە سەریانەوە ئەسوڕێتەوە هەر بۆ ئەوانە ئەگەڕێت
وەك خوای گەورە سۆزو بەزەیی نەیەت بەگۆڕیدا
هەمیشە مونکیرو نەکیر لە گۆڕیدا بن بۆ ئازاردانی )

## بەشی سێیەم

# شێرکۆ لە میسر

## یەکەم

## شێرکۆ لە پلەی وەزارەت دا [(١)]

دانایان گوتوویانە : " باشی وولات بە باشی شایەکەوەیەتی ، و باشی شا بە وەزیری باشەوەیە " [(٢)] ئەم دەستورە بەشێوەیەکی بەجێ ، پێش ئەوەی شێرکۆ ئەم پلەو پایەیە بگرێتە دەست هەر بووە [(٣)] و لەدوای خەلافەت لەدەوڵەتی ئیسلامیدا دووەم فەرمان وەزارەت بووە لە ڕووی بایەخ و گرنگییەوە [(٤)] ، شێرکۆش لەم پلەیەدا گەلێك سەرکەوتوو بووە، دوای ئەوەی خەلیفە عازید لەجێی شاور لە١٧ی بەهاری ساڵی ( ٥٦٤ ك ) ١٨ یەنایەری ساڵی ( ١١٦٩ ز ) لە کۆشکی خۆی لە قاهیرە پێشوازی لە شێرکۆ کردو پۆستی وەزارەتی لەگەڵ پۆشاکی تایبەتی پێ بەخشی [(٥)] ، ئەمەش لە ڕێ و ڕەسمێکی تایبەتیدا بە ئامادە بوونی گەورە کاربەدەستانی دەوڵەتی فاتمیدا [(٦)].

فاتمییەکان بەجۆرێك ئاهەنگیان بۆ دەگێرا، وەك هێمایەك بۆ سەرومری و گەورەیی و فراوانی دەستەلاتی وەزیر بەسەر شمشێرو قەڵەمدا [(٧)] ، بەوێنەی ئەو ئاهەنگەی خەلیفە عازید بۆ شێرکۆی ساز کردوو هەر بەم بۆنەیەوە گەلیك کەلوپەلی بە نرخی کۆشکی پێشەکەش بە شیرکۆ کردووە [(٨)] .

---

(١) زاراوەی وەزیر لە قورئاندا هاتووە ( سورەتی طە : ٢٩ ) ، وە ئەگەر راڤە بکرێت وشەی ( وەزیر ) سێ مانا بە دەستەوە دەدات :

یەکەم : بەواتای هەڵگرتنی زۆرترین ئەرکەکانی سەرشانی خەلیفە .

دووەم : (ملجأ) پەناگە، کەسێك پەنای بدرێت بەر وەك راوێژکار بۆ زانینی راو بۆچون و زانیاری لەسەر هەر بابەتێك بێت .

سێیەم : بەمانای پشت دێت ، واتا دەبێتە کۆڵەکەیەك لە راگرتنی دەستەلاتی خەلیفەدا ( الثعالبی: تحفة الوزراء ، ل ٣٩ ؛ غرس الدين بن شاهين : زبدة كشف الممالك ، ل ٩٣ ؛ عبدالعزيز الدوري : النظم الاسلامية ، ل ١٥٩ ) .

(٢) النويری : نهايه الارب ، ج ٦ / ل ٩٢ ؛ محمداحمد : الوزراء العباسيون ،ج١ / ل٥ .

(٣) وەزارەت لە سەردەمی خەلافەتی عەباسیدا دەرکەوتووە . ( المسعودی : مروج الذهب ، ج٣ / ل ٢٩٨ ؛ عبدالمنعم ماجد : نظم الفاطميين ، ل ٢٣٩ ) .

(٤) الجهشياری : كتاب الوزراء والكتاب ، ل٨ ؛ صبح الاعشى ، ج٤ / ل ٢٨ ، ٣٤ ؛ ج ٥ / ل ٤٤٨ .

(٥) ( ئيبن ئەبی طي) دەڵێت : ئەم بەرگە لەمێزەرەکەیدا تایبەت بووەو بەجوانی بەئاڵتون چنراوەو لەگەڵ پشتێنی زێڕو شمشێریش خەلات دەکرا . لە ( الروضتين ، ج ١ / ل ١٥٩ ) وەرگیراوە .

(٦) تهذيب تاريخ دمشق الكبير، ج٦ / ل٣٦٠ ؛ النوادر السلطانية ، ل٤٠ ؛ الروضتين ، ج ١ / ل ١٥٨ ؛ وفيات الاعيان ، ج٢ / ل ٤٨٠ ؛ اتعاظ الحنفا ،ج ٣ / ل ٣٠٢ ؛ شفاء القلوب ، ل ٣٥ .

(٧) الروضتين، ج١/ ل ١٥٨.. ١٥٩؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل ١٦٣؛ محمد عبدالله : الحاكم بامر الله واسرار الدولة الفاطمية ، ل ٣١٢ .

(٨) الكامل ، ج ٧ / ل ١٩٩؛ مرآة الزمان ، ج ٨ / ق١ / ل ٢٧٨ ؛ البداية والنهاية ، ج ١٢ / ل ٢٥٦ ؛ النجوم الزاهرة ، ج ٥ / ل ٣٥١

هەر لەکۆشکدا نازناوی پاشای سەرکەوتووی [1] پێ بەخشیوە لەگەڵ میری سوپادا [2] ، پاشان بەبۆنەی دەستبەکار بوون و وەرگرتنی وەزارەتەکەیەوە ، خەلیفە نوسراوێکی بۆ دەرکردوو بەدەست و پێنووسەکەی خۆی بەشێکی لێ نووسیبوو [3] . شێرکۆش سوپاسی خەلیفەی کردوو دوایی رووی کردە ماڵی وەزیر، کە پێشتر شاور تێیدا دەژیاو بەر شاڵاوی تاڵان کەوتبوو هیچی تێدا نەمابوو ، بەڵام شێرکۆ کاروباری خۆی تێدا ریکخستەوە [4] . بۆچوونی دیکەش هەن لەم بارەیەوە کە دەڵێن : شێرکۆ پۆستی وەزارەتی پێش کوشتنی شاور پێ دراوە [5] .

شێرکۆ لەماوەی وەزارەتەکەیدا کەوتە ریکخستنی دەوڵەت ، کە ئاژاوە باڵی بەسەردا کێشابوو ، دەستی کرد بەنەهێشتنی زوڵم و زۆرداری لەسەر میسرییەکان، ئەوەیش لە رێی کارزانی و لێهاتووی خۆیەوە وەك خاوەن ئەزمونێك لەم بوارەدا، کاروباری بە وانەی جێی متمانەی بوون دەسپاردو و خەڵاتی سەرلەشکرو میرەکانی بەوە دەکرد، کە زەوی و ناوچەی چاکی پێ دەبەخشین [6] . لەو میرانەی لەگەڵی بوون، هەندێکیانی وەك راوێژکار دانابوو لەبوارەکانی بەریوەبردندا ، کاربەدەستانی پێش خۆی لەشوێنی خۆیان هێشتەوە ، بێ ئەوەی پەنا بەلابردن و گۆرینیان بەرێت ، بەم رەفتارە باشەی بوو بووە مایەی راکێشانی سەرنجی دۆست و دوژمنانی [7] . پاشان نیگەرانی خۆی بۆ دانیشتوانی سەر لێشێواوی ( فستات ) دەربری و دەستی هاریکاری و کۆمەکی بۆ درێژ کردن ، بە دابین کردنی شوێن بۆ یان و دواتر بۆ شارەکەی خۆیانی گێرانەوە [8] .

---

(١) خریده القصر ، ج ١ / ل ١٢ ؛ زبده الحلب ، ج ٢ ل ٣٢٨ ؛ مفرج الكروب ، ج ١ / ل ١٦٣ ؛ المختصر فی اخبار البشر ، ج٣ / ل ٤٦ .

(٢) میری سوپا : ئەم نازناوە لە دەولەتی فاتمیدا لەسەرکردەی سوپا دەنرا ، پاشان دەدرا بە وەزیری رێ پێدراو وەشێرکۆ سەرکردەی سوپای میسرو شام بوو، پێیان دەگوت (سلطان الجیوش) ، (الروضتین ، ج١ / ل١٥٩؛ عبدالمنعم ماجد نظم الفاطمین، ل٨٤) ؛ وە البرشاندور دەڵێت : شێرکۆ لە ئاستی سەرەك وەزیرانی ئێستادا بووە .(صلاح الدین ، ل ٦٤)

(٣) بروانە پاشکۆی ژمارە ( ٣ ) .

(٤) تاریخ الباهر ، ل ١٤٠ ؛ زبده الحلب ، ج ٢ / ل ٣٢٨ ؛ شفاء القلوب ، ل ٣٥ .

(٥) وفیات الاعیان ، ج٧ / ل ١٤٨ ؛ مراة الجنان ، ج٣ / ل ٣٧٤ ؛ شذ رات ، ج ٤ / ل ٢١١ .

(٦) النوادر السلطانیة ، ل ٤٠ ؛ تاریخ الباهر ، ل١٤٠ ؛ الروضتین ، ج ١ / ل ١٥٩ ؛ ارنست بارکر : الحروب الصلیبیه ، ل ١٦١.

(٧) الکامل ، ج ٧ / ل ١٩٩ ؛ الروضتین ، ج ١ / ل ١٥٩ .

(٨) اتعاظ الحنفا ، ج٣ / ل ٣٠٢ـ ٣٠٤ ؛ قدری قلعجی : صلاح الدین ، ل ١٨٧ ؛ پ١ .

دوای ئەوە دەستی کرد بەگەڕان لەناو شاری قاهیرەدا ، وە بەبینینی وێرانبوونی زۆر گەرەك و سوتانی هەندێك خانوو زۆر دڵگران بوو، لەبەرئەوە داوای لە (القاضي الفاضل) [١] کرد ، کە پیاوماقوڵانی شاری قاهیرەی بۆ کۆبکاتەوە ، پێشوازی گەرمی لێکردن و زۆر بەڕێزەوە دڵنەوای دەکردن و بەڵێنی ئەوەی پێدان، کە بەهەمووجۆرێك پشتگیریان لێدەکات و ئەوانەی بەزەرەرو زیان کەوتون قەرەبووی زیانەکەیان بۆ دەکاتەوە، پاشان گوتی :" ئەم وڵاتەی ئێوە هی منیشە لەوانەیە لێرە بمێنمەوە" بەشداربوان زۆر سوپاسیان کرد [٢] .

شێرکۆ ، سەبارەت بە هەڵس و کەوت و رەفتاری لەگەڵ خەلیفە عازید دا ، زۆر بەڕێزەوە بوو ، ئەوەندە بەڕێز بوو لە کۆشکدا خەلیفە لەیەکەم کۆبوونەوەی لەگەڵ شێرکۆدا بە مامۆستا (الاستاذ) ناوی دەهێنا [٣] . رەفتارە جوانەکانی شێرکۆ، مایەی سەرنج راکێشانی خەلیفەو کاربەدەستانی ناو کۆشك بوو بەجۆرێك ،کە شوێنێکی زۆر گەورەی لە دڵی هەموویاندا داگیر کردبوو [٤] و جڵەوی کاروباری بەشێوەیەك گرتبووە دەست ، وەك بڵێیت میسر بووە پارچەیەك لە شام ، چونکە شێرکۆ هەمیشە خۆی بەجێگری نورەدین مەحمود زانیوە ، هەرچەندە پایەی وەزیری بووە [٥] .

خەلیفە نووسراوی بۆ نورەدین نارد ، کە شێرکۆ بوو بە وەزیر لە قاهیرە و لە مسردا دەمێنێتەوە [٦] بەگەیشتنی ئەم هەواڵە بە دیمەشق و حەلەب و شارەکانی دیکە ، خەڵکی زۆر شادمان و دڵخۆش بوون و شاعیرەکان دەستیان کرد بە هۆنینەوەی هۆنراوەی پیدا هەڵدان بەسەر شێرکۆدا [٧] ، بەڵام نورەدین بە بیستنی نەگەڕانەوەی شێرکۆ زۆر دڵگران بوو، زۆر هەوڵی دا تا خەلیفە عازید قایل بکات ،ئەویش شێرکۆ بەگەڕانەوە بۆ شام رازی بکات ، بەڵام ئەم هەوڵە سەرکەتوو نەبوو،

چونکە شێرکۆ کارەکانی خۆی لە قاهرەدا زۆر بەسەرکەوتووی و لێهاتووی بە ئەنجام دەگەیاند ، وڵاتی بەشێوەیەك بەڕیوە دەبرد ، بێ ئەوەی کەسی لێ برەنجێت و دڵگران بێت [٨] .

---

(١) (القاضي الفاضل عبدالرحيم بن علي البيساني پاشان عسقلاني) زۆر شارەزابووە لە دارشتن و نووسیندا ، لەدایك بووی ساڵی (٥٢٩ ك / ١١٣٤ز) نوسەری شێرکۆ بووە لە وەزارەتەکەیدا لەمیسر ساڵی (٥٩٦ ك / ١٢٠٠ ز) کۆچی دوایی کردووە . ( وفيات الاعيان ، ج ٣ / ل ١٥٨).

(٢) النوادر السلطانية، ل٤٠ ؛ الروضتين، ج١/ ل١٧٢؛ اتعاظ الحنفا، ج٣ / ل٣٠٢.

(٣) الروضتين ، ج ١ / ل ١٥٩ ؛ اتعاظ الحنفا ،ج ٣ / ل ٣٠٢ .

(٤) النوادر السلطانية ، ل ٤٠ ؛ الروضتين ، ج١ / ل ١٥٩ ؛ النجوم الزاهيرة ، ج ٥ / ل ٣٥٢ .

(٥) زبدة الحلب ، ج٢ / ل ٣٢٨ ؛ حسن المحاضرة ، ج ٢/ ل ٢٠ .

(٦) اتعاظ الحنفا ، ج٣ / ل ٣٠٢ .

(٧) مفرج الكروب ، ج ١/ ل ١٦٣ — ١٦٤ ؛ تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج ١/ ل ٤٥ ؛ عبداللطيف حمزة : ادب الحروب الصليبية ، ل ٩٦.

(٨) الروضتين ،ج ١/ ل١٥٩ ؛ اتعاظ الحنفا ، ج ٣ / ل ٣٠٢– ٣٠٤ .

شێرکۆ بۆ چەند هەفتەیەکی کەم بووە گەورەی هەموو میسر ، وە نازناوی پاشای وەزیری لێنرا [1] .

شێرکۆ لە دوا ساڵەکانی تەمەنیدا کارێکی پیرۆزی بۆ هەموو موسڵمانان بەجێ هێنا لەو یەکێتیەی هێنایە دی ، هەرچەندە گەلێك لە سەرکردە موسڵمانەکانی پێش خۆی هەوڵ و کۆششی زۆریان بۆ دابوو ، لەوانە سەرەتا لە شەرەفە دین مەودود و دوای ئەوە عمادەدین زنگی و نورەدین ی کوری تا دەگاتە شێرکۆ ، ئەم پیاوە بەو سەرکەوتنە گەورەیەی تاجی کۆتایی لەسەر نا ، ئەو خەوە ی ،کە زۆر بەی کات لە پێناویدا غەزایان دەکرد ، هێنیایە دیتن [2].

پاشان شاعیرەکان دەستیان کرد بەگوتنی هۆنراوەی پیاهەڵدان بەسەریدا لە ئەنجامی دەستەبەر کردنی ئەو دەستکەوتە مەزنە بۆ موسڵمانان . لێرەدا عمادی نوسەر ( الکاتب ) ئەم هۆنراوەیەی بەسەردا هەڵداوە بەبۆنەی وەرگرتنی پۆستی وەزارەت لە میسر و لەهەمان کاتیشدا سەر بە نورەدین مەحمودیشە ، دەڵێت :

| | |
|---|---|
| بالجد أدركت ما أدركت لا اللعب | كم راحة جنيت من دوحة التعب |
| تحل من ملك مصر رتبة قصرت | عنها الملوك فطالت سائر الرتب |
| فتحت مصرا وارجو اتصير بها | ميسرا فتح بيت المقدس عن كثب |
| قد امكنت أسد الدين الفريسة من | فتح البلاد فبادر نحوها وثب [3] |

---

(1) الروضتين ، ج ١ / ل ١٥٩ ؛ وفيات الاعيان ، ج٢ / ل ٤٨٠ ؛ مفرج الكروب ، ج ١ / ل ١٦٨ ؛ مراة الجنان ، ج ٣ / ل ٣٧٤ ؛ رانسيمان : الحروب الصليبية ، ج٢ / ل ٦١٨ .

(2) تهذيب تاريخ دمشق الكبير ، ج ٦ / ل ٣٦٠ ؛ السيد الباز العريني : الحروب الصليبية ، ج١ / ل ٧٠٥ ؛ Stevenson . The crusaders . p. 198 .

(3) الروضتين ، ج١ / ل ١٥٩ ؛ مفرج الكروب ، ج ١ / ل ١٦٤ – ١٦٥ .

( بەتێکۆشان گەیشتی بەوەی کە بەدەستت هێناوە نەك بەگاڵتە

چەند ئاسوودەیت بینی لە باخچەی هیلاکی دا

لە وڵاتی میسر ئەگەیت بە پلەیەك کە پاشاکان ئەی گەیونەتێ

هەرگیز وە لە هەموو پلەکانی تریش بەرزو بڵندتر ئەبیتەوە

ئەوا میسرت گرت هیوادارم کە ئاسان ببێت

بەو گرتنەی میسر گرتنی بەیت و المقدیس بێت

دەسەڵاتت پەیدا کردووە ئەی شێرکۆ بەسەر نێچیردا

لە گرتنی وڵاتدا و بەرەو ئەو نێچیرە برۆ بۆ گرتنی ) .

دووەم

## ئەنجامەکانی گرتنی میسر

شێرکۆ ، زانیویەتی رزگار کردنی قودس هەنگاوی یەکەمی لە گرتنی میسرەوە دەست پێ دەکات ، هەر لەبەر ئەوەش بوو، کۆڵی لە هێنانە دی ئەو خەونەی موسڵمانان نەدەهێنا، تا ئەو کاتەی تاجی سەرکەوتنی نایە سەر ، لەکاتێکدا دەوڵەتی فاتمی لە میسر ژێردەستەی دەوڵەتی خاچیەکان بوو ، بەڵگەی ئەم ژێر دەستیەی فاتمییەکان ئەوە بوو شای بەیت و لمقەدیس ( ئەمارلیك )ساڵانە باجی لێ وەر دەگرتن [1] .

بە سەرکەوتنی شێرکۆ، میسر لە ستەم و زۆرداری خاچیەکان رزگاری بوو، وەبوو بە بەشێك لە دەوڵەتەکەی نورەدین مەحمود ، کە سنورەکەی هێندە فراوان بووبوو لە خۆرهەڵاتەوە ، رووباری فورات و لە خۆرئاواوە دەگەیشتە رووباری نیل.

ئەم سەرکەوتنە هەنگاوێکی بەبایەخ بوو لە تەواوکردنی بەرەیەکی یەکگرتووی ئیسلامی بەهێز لەناوچەکەدا ، کە پێشتر جیاوازی ئاینزا ( رێباوەر - مەزهەب ) ی شیعە و سوننە کوسپ بوون لە بەردەمیدا ، دەوڵەتی فاتمی زۆری نەخایاند بەتەواوی هەرەسی هێنا ، کە بەمەش یەك پارچەی میسرو شامی زیاتر هێنایەدی ، ئەم یەکپارچەیی‌یە بواری بۆ موسڵمانان رەخساند، کە بەچاکی گوشار بخەنە سەر خاچیەکان ، چونکە بەیت و لمقدیس کەوتە نێوان بەرداشی گوشاری هێزی لەشکری موسڵمانەکان لە میسرو لەلایەکی دیکەوە لە شام [2] هەروەها موسڵمانەکان دەتوانن لەکاتی شەڕدا ، گوشاری سەربازە خاچیەکان لەسەر شام کەم بکەنەوە ، ئەگەر لە دەلتاوە لەشکر لە میسرەوە بۆ سەر کەناراوەکانی شام بەرێ بکرێت بۆ شەر لەگەڵ خاچیەکاندا [3] .لەهەمان کاتدا هێزی دەریای موسڵمانەکان دەتوانێت بەرنگاری ئەو کۆمەك و یارمەتیانە ببێتەوە ،کە ئەوروپا بۆ پشتگیری خاچیەکان دەینێرێت . لەبەرئەوە خاچیەکان لەم سەرکەوتنەی شێرکۆ کە بەرەو رویان بوەتەوە زۆر سڵەمینەوەو بەکارەساتێکی مەزنیان لە قەڵەم دا، [4]

---

(١) تاريخ الباهر ، ل ١٣٧؛ الروضتين ، ج ١ / ل ١٤٥ ؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل ١٥٦ : تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج ١ / ل ١٩ ؛ سعيد عاشور : الحركة الصليبية ، ج ٢ / ل ٦٦١ .

(٢) النوادر السلطانية ، ل ٨٠ – ٨١ : مفرج الكروب ، ج ٢ / ل ٢٠١ ، ٢٠٥ ؛ ارنست باركر : الحروب الصليبية ، ل ١٨٣ ؛ . Stevenson .The crusaders in the east p . 198

(٣) الروضتين ، ج ١ / ل ١٨٠ ؛ محسن محمد حسين : صلاح الدين ، ل ٢١ .

(٤) الروضتين ، ج١ / ل ١٥٤ ؛ ١٧٣ – ١٧٤ ؛ وفيا الاعيان ، ج٢ / ل ٤٤٦ ؛ تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل ٢٠ .

نورەدینیش لەباری ئابوورییەوە ، توانی سوود لەمیسـر وەربگرێت لـە بـەهێز کردنی بەرەی موسڵمانەکاندا ، لە رووی توانای مرۆیی میسرییەکان و خێرو بێرو داهـات و سامانی میسر ، کە گەلێك دەوڵەمەند بـوو [1]. جگـە لـەوەی موسـڵمانەکان توانیـان بـە نەهێشتنی ڕێی هاتوچۆ لەنیوان میسرو شارەکانی ژێر دەستی خاچیەکان، بە پێچەوانـەوە بازرگانی خاچیەکان کەم بکەن و هێزی دەریایی موسڵمانەکانیش دەستی بەسەر زۆر ڕێگای ئاویدا گرت .

مێژوونووس ، ( ولیەم صوری ) لەسەر ئەم رووداوە زۆری نووسیوە ،باس لە هێمنـی و ئارامی سەر سنورەکان دەکات پێش گرتنی میسر ، چۆن خەلکی بەخۆشی دەژیان ، بـەلام دوای گرتنی میسر ئەو ئارامی و خۆشی ژیانەی خاچیـەکان پێچەوانـە بوەتـەوە [2] . خـۆ ئەگەر میسر بکەوتایـە ژێـر دەسـەلاتی خاچیـەکان ، سـەرەتا دەیـان کـردە بنکەیـەکی سەربـازی دژ بە موسڵمانەکان لە شام ، بەم کـارەش موسـڵمانەکان دەبوونـە دوویـەرەی دژ بەیەك ، و خاچیەکان لە میسرو شامدا بالادەست دەبوون و بەئاسانی گوشـاریان دەخسـتە سەر نورەدین مـەحمود [3] ، لـە باشـوورەوە بـەیت ولمـەقدیس و لـەباکوورەوە میرنشـینی ئەنتاکیەو تەرابلس ، کە هەڕەشەیەکی مەترسی دار دەبوون لەسەر ئایندەی موسـڵمانەکان لە ناوچەکەدا ، ئەو دەمە دەرکردنیان لە فەلەستین و شام و میسردا زۆر گران دەبوو .

سـەربارەی ئەمانـە ، شـێرکۆ توانـی بنـاغـەی خـێزانێك دابنێـت لـەئایندەدا فەرمانڕەوایی میسر بگرێتە دەست ، کە لە مێژوودا بەئەیوبییەکان ناسراون و میسر بکەنـە بنکەیەکی بەرهەڵستکاری خاچیەکان ، کـە دوای ( بیسـت ) سـاڵ بـەری سەرکەوتنەکـەی شێرکۆ لە گرتنەوەی قودس دا دەرکەوت [4] .

لێرەدا دێڕێك هۆنراوەی عەرقەلە دەکەینە نمونە کە باسـی بنەماڵـەی شـێرکۆ دەکات لە فەرمانڕەوایی میسردا و دەڵێت :

اصبح الملك بعد ال علي مشرقا بالملوك من ال شادي [5]

---

(١) الروضتين ، ج١ / ل١٧١ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٦ / ل٨ ؛ سعيد عاشور : الحركة الصليبية ، ج٢ / ل٦٨٨ .

(٢) له السيد الباز العريني : الحروب الصليبية ، ج١ / ل٧٠٦ — ٧٠٧ وەرگیراوە .

(٣) الكامل ، ج٧ / ل١٩٦ ؛ الروضتين ، ج١ / ل١٨٢ ؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل١٦٠ .

(٤) الروضتين ، ج٢ / ل١٩٤ — ١٩٥ .

(٥) ديوان عرقلة الكلبي ، ل٣٧ .

( پاشایەتی لەدوای بنەماڵەی عەلی ڕووناك بوەوە بە پاشاکانی بنەماڵەی شادی )

سێیەم

## پەیوەندیی خەلیفەی عەبباسی بە هەڵمەتە سەربازییەکانی شێرکۆوە بۆ سەر میسر

لە ڕاستیدا پەیوەندی نێوان نورەدین مەحمود و خەلیفەی عەبباسی باش بووە و نورەدین جێی ڕەزامەندیان بووە [1] ، چونکە هەردەم نورەدین و شێرکۆی سەرکردەی سوپاکەی لە غەزاکردندا بوون ، بەم کارەشیان ئەوەندەی تر لای خەلیفەی عەبباسی جێی ڕێز و خۆشەویستی بوون و تەنانەت گرتنی میسریشیان بە غەزا کردن لەقەڵەم دەدا و لەوەش دەترسان، کە خاچیەکان سوود لە گرتنی میسر وەربگرن و خۆیانی پێ بەهێز بکەن ، ئەمە لە لایەك ، لەلایەکی ترەوە فاتمیەکان ( شیعه ) مەزهەب بوون و دژی خەلیفەی عەبباسی بوون. هەر ئەم هۆکارە گرنگە بوو ، کە هانی خەلیفەی عەبباسی دەدا لە پشتگیری کردنی نورەدین و شێرکۆ بۆ لەناو بردنی دەسەڵاتی فاتمیەکان [2] ، لەکاتێکدا خەلافەتی عەبباسی بێ توانا بوون لە ئاست بەجێ هێنانی دا .

گەلێك بەڵگە هەن، لەسەر هاندانی نورەدین لەلایەن خەلیفەی عەبباسیەوە بۆ ئەو مەبەستە ، لەوانە لەساڵی ( ٥٤٩ ك / ١١٥٤ ز ) دوای دانانی خەلیفە ( فائیز ) بە خەلیفەی فاتمیەکان لە میسر لە تەمەنی ( پێنج ) ساڵیدا . ( خەلیفە موقتەفی ) [3] ، بەنوسراوی ڕەسمی ڕێ بە نورەدین مەحمود دەدات ، تا بچێت میسر بگرێت بەناوی خەلیفەی عەبباسیەوە [4] .

---

(١) المنتظم ، ج١٠ / ل٢٤٩ ؛ الروضتين ، ج١ / ل١٩٤ ؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل١١٥ ، ٢١٨ .

(٢) المنتظم ، ج١٠ / ل١٥٨ ، ٢٠٨ ؛ مرآة الجنان ، ج٢ / ل٢٩٥ ؛ كتاب دول الاسلام ، ج٢ / ل٤٦ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٦ / ل٨ .

(٣) خەلیفە موقتەفی : محمد کوڕی ئەحمەد ئەلموقتەفی کوڕی مستظهر ، لەساڵی ( ٥٣٠ ك / ١١٣٥ ز ) بۆتە خەلیفە لە بەغدا ماوەی ٢٤ ساڵ و سێ مانگ فەرمانڕەوایی کردووە لە تەمەنی ٦٦ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە . ( وفيات الاعيان ، ج٦ / ل٢٤٣ ؛ باقر امين الورد : بغداد و خلفاؤها ، ل٦٤ ) .

(٤) الكامل ، ج٧ / ل١٠٦ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣٠٦ ؛ مرات الجنان ، ج٣ / ل٢٩٥ ؛ حسن المحاضرة ، ج٢ / ل٢ .

بەلام سەرقالی نورەدین لە بەگژداچوونی خاچیەکاندا ،بۆی نەکرا لەو کاتــەدا ئەو کارە بەئە نجام بگەیێنێت ، هەرچەندە لەنوسراوەکەی خەلیفەدا ئەوە ئاشکرا کرابـوو ، کە ئەو کەسەی بتوانێت میسر بگێڕێتەوە بــۆ باوەشــی خەلافــەتی عەبباســی ، دەکرێتــە فەرمانڕەوای میسر[1]، هەر لەبەر ئەوەشە، کە بەبەردەوامی وتووێــژ لــەنێوان خەلیفــەی عەبباسی و نورەدین و شێرکۆدا بووە . ئەوانیش داوایان لە خەلیفەی عەبباسی دەکرد ، کـە کرتنەوەی میسریان بە غەزای ئایینی بۆ لەقەلــەم بـدات[2] بــۆ ئــەم مەبەســتە شــێرکۆ گەلێك جار سەردانی بەغدای کردووە، بۆ بینینی خەلیفە ( المستنجد بالله )ی[3] عەبباســی سەبارەت بەهەلمەتی سەربازی بۆ سەر میسر . وەك دەردەکەوێت ئەم ســەردانەش لــەکاتی یەکەم هەلمەتی ســەربازیدا بــووە[4]. چونکــە لەســالی ( ٥٥٩ك / ١١٦٣ ز ) دا ، هــەوالی گەیشتنی شێرکۆ بۆ میسر گەیشتە بەغداو لەو بارەیەوە مژدە بەخەلیفە موســتە نجید درا ، لە هۆنراوەیەکدا ( الحاجب ، ابی الفضائل الحسین ابن محمــد بــن ترکــان ) کــە لەســالی ( ٥٥٩ك ) لە بەغدا بەبۆنەی یەکەم هەلمەتی سەربازی شێرکۆوە ،کــە چۆتــە میســر . لــە ئە نجامی ئەم سەرکەوتنەدا نوسیویەتی[5].

---

(١) کتاب دول الاسلام ، ج٢ / ل٤٦ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣٨٧ ؛ شذرات ، ج٤ / ل١٥٢ .

(٢) سعيد عاشور : الحركة الصليبية ، ج٢ / ل٦٨٨ .

(٣) المستنجد بالله العباسي ( ٥٥٥ — ٥٦٦ ك ) ( ١١٦٠ — ١١٧٠ ز ) کوری خەلیفە موقتەفی بوو دوای مردنی باوکی کرا بە خەلیفەی بەغدا ماوەی ١١ سال لە خەلافەت دا بوو ، تا لەبەهاری سالی ( ٥٦٦ ك / ١١٧٠ ز ) کۆچی دوایی کرد .

( وفيات الاعيان ، ج٦ / ل٢٤٥ ، ٢٤٨ ؛ باقر امين الورد : بغداد و خلفاؤها ، ل٦٩ )

(٤) حسين مؤنس : نور الدين محمود ، ل٢٩٨ ، ٣١٨ .

(٥) المنتظم ، ج١٠ / ل ٢٠٨ ؛ الروضتين ، ج١ / ل١٩٧ ؛ هۆنراوەکە دەلێت :

| | |
|---|---|
| لعـل حداة العيـس ان يتوقفـوا | ليشفـي غليـلا بـــالمدامع مــدنف |
| ليـهنك يـــا مولـــى الانام بشارة | بها سيف الــدين اللــه بالحق مرهف |
| ليـهنك يـــا مولاي فتــح تتابعت | اليك بــــه خوص الركـــائب توجف |
| اخذت به مصرا وقد حال دونها | من الشرك ناس في الحي الحق تقذف |
| فعـادت بحمد اللـه باسم امامنا | تتيـــة علـــى كـــل البـلاد و تشرف |

ماناکەی :

| | |
|---|---|
| نــاخۆشی و پــرسە پێویستــە بوەستێت | هــەتــا فرمێسك ڕشــتن کــــــەم بێت |
| بــۆ ئـــەوەی ئـەی مەولای مــژدەیـــەك | بدرێ لەلایەن شمشێری ئایینی خواوە |
| بـــە ڕاستیەکـــی ڕوون بەو پزگارکردنەی | کــــــە وەك ئـــــەوانــــەی تـر بـوو |
| میســــرت وەرگـــرتەوەو بــێ بـــاوەڕییان | بیــــــرچـوەوە تەنیــا حەقیان لە بیرە |
| گەڕایەوە بەحەمدی خواو بەناوی پێشەوای ئێمە | بۆ هەموو ولات وە سەرپەرشتی ولات دەکات |

كە بەهۆی دانایی و زیرەكی وەزیــرەوە بــوو . هــەروەها ئــەم وەزیــرە لــەم كاتــەدا نوسراوی ناردووە بۆ نورەدین مەحمودو داوای لێكردووە ( خوتبە ) لە میسر بــەناوی خەلافــەتی عەباسیەوە بخوێنرێتەوە . بەو مەبەستەی لەسەر دەستی ئەمدا ئەمكارە بــە ئــە نجام بدرێــت [1]، هەوڵی خەلافەتی عەبباسی بۆ ئەم مەبەســتە هــەر بــەردەوام بــوو، هەمیشــە پشــتگیری كردووە لەم ڕووەوە . لێرەدا سەبارەت بەدووەم هەڵمەتی سەربازی ( ئەحمــەد بیلــی ) دەڵێــت : " بەزمانی خاوەنی كتێبی قودسیەوە، " .دووەم هەڵمەتی سەربازی شێركۆ بــۆ ســەر میســر بــە بڕیــارو ڕەزامــەندی خەلیفــەی عەباســی بــووە ســاڵی ( ٥٦٢ ك / ١١٦٦ ز ) [2]. مێژوونوســـی خاچیەكان ( ولیم صوری ) دەڵێت :" خەلیفەی عەبباسی لەم هەڵمەتەی شێركۆدا داوای لەگشــت میرە كوردەكان كردووە .كە پشتگیری شێركۆ بكەن"[3].

دوای گــەڕانەوەی شێركۆ لە هەڵمەتە سەربازییەكەی ، ( عیمادەدینی الكـــاتب ) لــە ساڵی ( ٥٦٣ ك / ١١٦٧ ز ) ی دا پارچە هۆنراوەیەكی بەسەردا هــەڵداوە بەڵگەیــەكی بــەهێزە لەسەر بوونی پەیوەندی خەلیفە بە هەڵمەتەكانەوە . لەم دێڕەدا دەڵێت :

انت من نازل الدعين في مصر لنصر الامام في بغداد [4]

نورەدین مەحمود دەربارەی دواهەڵمەتی سەربازی بۆ سەر میسر، خەلیفەی عەبباسی لەوە ئاگادار كردۆتەوە، كەخەڵكی میســر حــەز بەگەڕانــەوە دەكــەن بــۆ ئــامێزی خەلافــەتی عەبباسی، دوای سەركەوتنی شێركۆ، عیمادەدینی هۆنراوەی بەسەردا هەڵداوەو دەڵێت:

رد الخلافة عباسية ودع الدعى فيها يصادف شر منقلب [5]

پــاش مردنی شێركــۆش ، پەیوەندی نێــوان خەلیفــەی عەبباســی و نورەدیــن هــەر بــەردەوام بــووە و نورەدیــن خەلیفـــەی لـــەزۆر ڕووداو ئـــاگادار كردۆتـــەوە [6] ، وەدوای خــوێندنەوەی خوتبە بەناوی خەلافەتی عەباسیەوە ســاڵی ( ٥٦٧ ك / ١١٧١ ز ) ، خەلیفــەی عەبباسی خەڵاتی بەنرخ و زۆر بەبـــەهای بــۆ نورەدیــن نــاردووە ، لــەناو خەڵاتــەكاندا دوو شمشێری تێدا بووە ، كە نیشانەی پێدانـــی جڵــەوی فــەرمانڕەوای میســرو شــامە بــەنورەدین لەلایەن خەلیفەی عەباسیەوە [7] .

---

(١) السیوطي : تاريخ الخلفاء ، ل٤٤٥ — ٤٤٦ .

(٢) صلاح الدين ، ل٨٧ .

(٣) له السيد الباز العريني : الشرق الادنى و الايوبيون ، ل٣٤ وەرگیراوە .

(٤) الروضتين ، ج١ / ل١٥١ .

( تۆ ئەو كەسەی كە ناكەسانی میسرت قەڵاچۆكردووە بۆ سەرخستنی خەلیفە لە بەغداد )

(٥) الروضتين ، ج١ / ل١٦٠ .

(٦) (ئیبن ئەبی طي) دەڵێت : خەلیفە ئەلمستەنجید باللە نوسراوی لە بەغداوە ناردووە بۆ نورەدین گلــەیی دواكــەوتنی خوێندنــەوەی خوتبــەی لێكــردووە لــە میســر . لـــــە (الروضتــين ، ج١ / ل١٩٦ ، ١٩٨ ) ؛ وەرگیراوە ، هەروەهــا بڕوانە (مفرج الكروب . ج١/ ل٢٠٠)

(٧) الكامل ، ج٧ / ل٢١٩ — ٢٢٠ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٦ / ل٦٤ ، ٧٦ ؛ شاكر احمد: الحروب الصليبية و الاسرة الزنكية ، ل٢٣١ .

چــوارەم

## کــۆچی دوایــی شێرکــۆ
## لـــە ساڵــی ( ٥٦٤ ك / ١١٦٩ ز )

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ حَتَّى إِذَا فَرِحُواْ بِمَا أُوتُواْ أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَـــإِذَا هُـــم مُّبْلِسُونَ ﴾ [١] شێرکۆ تەنها دوو مـــانگ و پێنــج ڕۆژ بــوو لــە وەزارەتەکــەیدا بــوو ، ڕۆژی شەممە ڕێکەوتی ٢٢ ی جەمادی دووەمی ساڵی ( ٥٦٤ ك ) بەرامبەر بە ٢٣ ی مارســـی ( ١١٦٩ ز)ی بۆ یەك جاری چاوی لێکنا [٢] ، و پاش ئەوەی خەلیفە عازید نوێژی لەسەر کـــرد [٣] ، لەشاری قاهیرە بە خاك سپێرا [٤] .

سێ ڕۆژ لە قاهیرەدا پرسەی بۆ دانرا [٥] و موسڵمانان بە گشتی بە کۆچی دوایـــی ئەو کەڵە پیاوە دڵگران و نیگەران بوون .

دەربارەی هۆکاری مردنەکەی شێرکۆ ، چەند بیرو بۆچونێك هەیە .

( ئیبن شەداد ) و ( ئیـبن ئــەبی طـي) دەڵێـن : هــۆی مردنەکــەی دەگەڕێتــەوە بــۆ خواردنی چەوری، چونکە شەوو ڕۆژ خەریکی خواردنی گــۆشتی نەرمەی ئەســتور بــووە، کــە بووە مایەی تووشبوونی بەنەخۆشی پەستانی خوێن، گەلێك جار ئــەم نەخۆشــیە توشــی دەبووو بە زەحمەت لێی ڕزگار دەبوو، بەڵام دواجــار بــەتوندی توشــی بــوومو ســەرئەنجام لەڕۆژی شەممە دوای خۆشۆردن کوشتویەتی [٦] . بۆچونێکــی تــر هەیــەو لــەو باوەڕەدایــە، کەکۆچی دوایی شێرکۆ لەئەنجامی خواردنەوەی ( زەهرە ) وە بــووە ، واتــە ژەهــر خــواردوو کراوە [٧] .

---

(١) سورة الانعام ٤٤ .

(٢) خريدة القصر ، ج١ / ل١٣ ؛ تـاريخ البـاهر ، ل١٤١ ؛ العبر في خبر من غبر ، ج٤ / ل١٨٥ ؛ الكواكب الدرية ، ل١٧٩ ؛شذرات ، ج٤ / ل٢١١ ؛ زامباور : معجم الانساب ، ل١٥٠ .

(٣) شفاء القلوب ، ل٤٤ .

(٤) زبدة الحلب ، ج٢ / ل٣٠٩ ؛ پ١ ، الروضتين ، ج١ / ل٣٠٩ ؛ وفيات الاعيان ، ج١ / ل٢٥٨ ؛ النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣٨١.

(٥) الروضتين ، ج١ / ل١٧٣ ؛ تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل٥٤ .

(٦) النوادر السلطانية ، ل٤٠ ؛ الروضتين ، ج١ / ل١٦٠ .

(٧) اتعاظ الحنفا ، ج٣ / ل٣٠٧ ؛ پ٢ ، تاريخ ابن الفرات ، مجلد ٤ / ج١ / ل٥٤ ؛ دائرة المعارف الاسلامية ، مجلد ١٤ / ل٣١

بەلام ( ئەحمــەد حەنبەلی ) مردنەکەی بە قـــەزاو قـــەدەر دانـــاوە و دەڵێـت : " کەس زەهری نەداوەتێ " [1] .

کە هەواڵی مردنــی شێرکۆ گەیشتە دیمەشق و نورەدین پێی زانی خـــەمێکی زۆری بۆ خواردووە [2] . لەساڵی ( ٥٧٩ ك / ١١٨٣ ز ) تەرمەکەی گواسترایەوە بۆ شاری ( مەدینـــە ) ی پیرۆز لەگەڵ ئەجمەدینی برای ، ئەم گواستنەوەیەش بە پێی ڕاسپاردەی پێـــش وەختــی خۆی بووە . و لە نزیکی گــــۆڕی پـیرۆزی پێغەمبــەر ( د. خ ) بـــەخاك سـپێردراوە و نێـوان گۆڕەکەیان ئەندازەی ( دەبـاڵ ) ێك دەبێت [3] .

( ئیبن عەساکر ) دەڵێت : " شێرکۆ کلیلی خێرو خۆشی بووە بـــۆ موسـڵمانـان و لای سەرجەم موسڵمانان خاتری هەیە ، چونکە میسری لە دەست خاچیەکان ڕزگـــار کـــرد " [4] .

( جورجی زەیدان ) یش دەڵێت : " ئەگەر شەش مانگ بەر لەوە بمردایـــە ، بـــەلای گـــەورەتر ڕووی لە موسوڵمانەکان بەتایبەتی نورەدین مەحمود دەکرد ، بەلام کـــاتێك کۆچـــی دوایـــی کرد ، ئەو ئەرکە قورسەی خـــرابووە ئەستۆی هەمووی زۆر بەچاکی بـــەجێ هێنـــاوەو " [5] ، کە پێشتر سەرکردە موسوڵمانەکان هـــەوڵ و کۆششـــی ئـــە نجامدانیان دەدا ، بـــەلام شـێرکۆ تـاجی سەروەری ئەو سەرکەوتنەی لەسەرخۆی ناوو ئەو خەونەگەورەیەی بەدی هێنـــا ، کـــە زۆرکات لە پێناویدا غەزایان دەکرد.

لەگەڵ ئەوەشدا ، بەری تەقەلای چـــەند ســـاڵەی بـــۆ برازاکـــەی ( ســـەلاحەدین ) بەجێهێشت ، کە بیرو بۆچوون هەیە دەڵێت :

گوایە شێرکۆ ، ڕای سپاردون لەدوای خۆی سەلاحەدین دابنرێ [6] .

---

(١) شفاء القلوب ، ل٤٤ .

(٢) حسين مؤنس : صور من البطولة ، ل٢٥٦ .

(٣) الروضتين ، ج١ / ل٢٠٩ ؛ وفيات الاعيان ، ج٢ / ل٤٨٠ ؛ العبر في خبر من غبر ، ج٤ / ل ١٨٥ ؛ شفاء القلوب ،ل٤٥ — ٤٦ ،

(٤) شذرات ، ج٤ / ل٢٢٧ .

(٥) تهذيب تاريخ دمشق الكبير ، ج٦ / ل٣٦٠ .

(٦) صلاح الدين الايوبي ، ل٨ .

(٧) النجوم الزاهرة ، ج٥ / ل٣٥٣ ؛ شفاء القلوب ، ل٤٤ .

لێرەدا هۆنراوەیەکی عیمادەدینی نوسەر دەنوسین ، کە پیاهەڵدانە بەسەر شێرکۆدا ، دوای مردنی و دەڵێت :

نؤمل في دار الفناء بقاء نا — ونرجوا من الدنيا صداقة مافت
و ما الناس الا كالغصون يد الردى — تقرب منها كل عود لناحت
لقد ابلغت رسل المنايا و اسمعت — ولكنها لم تحظ منا بناصت
فلهفى على تلك الشمائل انها — لقد كرمت من الحسن عن نعت ناعت [1]

لە شوێنێکی دیکەدا هەر عیمادی نوسەر سەرخۆشی لە نەجمەدینی برای دەکات و دەڵێت :

ما بعد يومك للمعنى المدنف — غير العويل و حسرة المتاسف
ما كان اسنى البدر لو لم يستتر — ما كان ابهى الشمس لو لم تكسف
ايام عمرك لم تزل مقسومة — لله بين تعبد و تعرف
متهجدا لعبادة ، او تاليا — من اية او ناظرا في مصحف
بالملك فزت ، وحذته عن قدرة — و مضيت عنه بسيرة المتعفف
و وصفت يا اسدا لدين محمد — مدحا بما ملك به لم يوصف [2]

---

(١) الروضتين ، ج١ / ل١٦٢ .

(خەڵکان وەك پەلی دارن وەدەستی مردن — هەموودارێکیان نزیك دەخاتەوە لە دارتاشێکی مردن
بەڕاستی مردن پەیامی خۆی گەیاند و — بەلام کەسی دەست نەکەوت گوێی بۆ بگرێ
داخی گرانم بۆ ئەو ڕەوشتە بەرزانە بەڕاستی — ئەوان زۆر ڕێزدار بوون بەهابوون لەجوانیدا )

(٢) الروضتين ، ج١ / ل١٦٢ ـ ١٦٣ ؛ مفرج الكروب ، ج١ / ل١٧١ ـ ١٧٢ ؛ تاريخ ابن الفرات ، مجلد٤ / ج١ / ل٥٤ — ٥٥ .

( لەدوای ڕۆژی تۆهیچ مانایەکی نییە — بێجگە لەناخۆشی و ناهەموری
چەندە ناخۆش بوو کەمانگی چواردە — شارایەوە چەندە ناخۆش بوو کە ڕۆژ گیرابوو
ڕۆژانی تەمەنت بە بەشکراوی نەماوە — لەنێوان خواپەرستی و ناسیندا
پاشایەکی سەرکەوتوو بویت وە پیایاندا — ڕۆیشتی بەپاکی و بێ گەردی
بە باشی پیاتا هەڵدرا ئەی شێرکۆ — کە هیچ پاشایەك وا پیا هەڵنەدراوە )

## دەرئەنجـــام

ئەو زانياريانەی لە دووتوێی ئەم نامەيەدا هــاتوون و وەك لێكۆڵينەوەيـەكی زانستی سەبارەت بەبنەچەو ڕەچەڵەكی خـێزانی شـيركۆو دواتــر بــەدواداچوونی ڕۆڵــی شيركۆ لە سەرجەم بوارەكانی سياسی و سەربازی و كارگێڕی و زانستی و چەندين لايـەنی تر، كە لەســەرەتای ژيــانيدا بەگشــتی و لــەنێوان ســاڵانی (٥٤١ ك /١١٤٦ ز) تــاوەكو (٥٦٤ك / ١١٦٨ز) بەتـايبەتی ڕۆڵی تێدا بينيوەو بە پێی ئەو زانيارانەی لــە نامەكــەدا هاتوون دەتوانين ڕستێك سەرنج بخەينە بەرچاو.

يەكەم:

ئەم خێزانە بەرەچەڵەك كوردن و سەر بە ڕێرەو و ئايينی ئيسلامن، دەربــارەی ئــەوەيش، كــە چــەند ســەرچاوەيەكی كــەم ڕەچەڵــەكيان دەباتـــە ســـەر عـــەرەب، بۆچوونەكانيان بەڵگەی پتەوو سەلمێنەريان پــێ نيــەو كەســی پــێ قــايل نابــێ و لــە ڕاستيەوە دوورن.

دووەم:

كەسێتی شيركۆ لە بواری سياسی و سەربازيدا ئاشكرايەو ديـــارە، كــە سـيمای سەركردە لە مێژووی پڕ لەڕووداوی سەرەدەمەكەيەوە هـــاتووە. ئەمــەيش بــە هاوكــاری لەگەڵ بارودۆخی كەسێتی و ڕۆشنبيری لــە پێناوی پێكـهێنـانی كەسـێتی بــەهێزدا يــان بەواتـايەكی تر، كوڕی كۆمەڵگەكەيەتی و بەرهەمی ژيری و تـايبە تمەندی هەر لـــەوێوە سەرچاوەی هەڵگرتووە.

ديارە لێكۆڵنەوە لەســەر قارەمــانێكی كــوردی وەك شــيركۆ تــابلۆی كــارێكی گرنگە، كە بەهۆيـــەوە خوێنــەر دەتوانێـت شــارەزايی دەســتگير بكــات دەربــارەی ئــەو بنەمايانەی كە بوونە هۆی دروســتبوونی ئــەم كەســێتيە درەوشــاوەيە، ئەمــەيش لــە جوامێری و وەفـــاداری و داد پــەروەری و ســوارچاكی و دبلوماســێتی، كەلەســەردەمەكەی خۆيدا هێمای مێژوويەكی پرشنگداربووە لە ڕەوڕەوەی مێژووی كوردو ئيسلامدا.

لێرەدا دەبێ ڕۆڵەكانی نيشتمان و هاوئاينەكانی شانازی پێوە بكەن، چونكــە لە هەموو كەسێك زياتر بەرەو ڕووی دەستدرێژی وەســتاوەو بەچەشــنی ســوار چــاكێكی ئەبەز زوربەی كاتی لە ئەسپی ئەبەردێتی دانەبــەزيوە، يــان بەواتـايــەكی تــر زيــن و پشــتی ئەســپەكەی مــاڵ و ئارامگــای بــووە، ديـارە بــۆ ئــەم مەبەســـتەيش بەڵگــە

